ولیام گای کار

# بەرد گەلێکی سەر تەختەی شەترەنج

Pawns in the game

وەرگێڕانی: بەختیار ئەحمەد سالح



**ناسنامەی کتێب**

- ناوی کتێب: بەردگەلێکی سەرنەختەی شەترەنج
- نوسینی: ولیام گای کار
- وەرگێرانی: بەختیار ئەحمەد سالح
- دیزاین و بەرگ: فواد کەولۆسی
- شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج
- سالی چاپ: ٢٠١٦
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن ( ١٧٩٦)ی سالی ی٢٠١٥ پێدراوە.

## پێڕست

(ڕیسەکانیان نابێتە پۆشاك و بە کردەوەکانیشیان پۆشتە نابن، کردەوەکانیان گوناهە و دەستەکانیان ستەم ئەکات. پێکانیان بەرەو خراپە هەنگاو هەڵئەهێنێت و پەلە ئەکات لە ڕشتنی خوێن، بیرکردنەوەیان خراپەیە. ڕێگەکانیان زەوت کردن و لەناو بردنە. ڕێگەی ئاشتی نازانن و دادپەروەر نین. ڕێگەی چەوتیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووەو هەر کەسێك بیگرێتە بەر ئاشتی بەخۆیەوە نابینێت)

*ئەشعیا- ٥٩*

# پیلان گێڕی جیهانی

## دەروازە

**پیشەی پیلان گێڕی زایۆنیزمی جیهانی بێ باوەڕ:**

ئەگەر ئەوەی من پەردەی لەسەر هەڵدەماڵم، ئەو کەسە توشی سەرسوڕمان ئەکات کە ئەم دێڕانە ئەخوێنێتەوە، ئەوا داواکارم لە خوێنەر کە هەست بەکەمی ئەکات کاتێك کە بە ئاشکرا بۆیڕون ئەکەمەوە کەمن لە ساڵی ١٩١١ دەست بەکار بوم بە ئامانجی پەی بردن بەوەی کە چی ڕێگری ئەکات لەوەی کە مرۆڤایەتی بە ئاشتی بژی لە ژێر سایەی ئەو خێروبێرەی کە خوا پێی بەخشیوە؟

تەنها لە ساڵی ١٩٥٠ دا توانیم پەی بەو نهێنیە بەرم کاتێك کە زانیم ئەو شەڕ و شۆڕانەی ژیانمان ژێروژور ئەکات و ئەو بێسەرەوبەرەییەش کە بە بێ هۆ زاڵە بەسەر ژیانماندا هیچ نیە جگە لە پلانێکی ئەهریمەنانەی بەردەوام، ڕەنگە ئەو پیلانە لەو بەشەی گەردون دەستی پێکردبێت کاتێك کە ئەهریمەن ڕەتی کردەوە کە وشەی خوا لەسەرو هەمو شتێکەوە بێت. لە بەهەشتەوە بۆ سەرزەوی. ئەو ڕاستی و بەڵگە حاشا هەڵنەگرە پەرتەوازانەی کە بەدەستم هێنان لە سەرتاسەری جیهاندا پچڕ پچڕن بون و ڕێك نەدەخران ئەمەش بەردەوام بو تا گەیشتمە ئەو ڕاستییە و تێگەیشتم کە زانیاریمان لەگەڵ بونەوەرێك دا نیە کە لە گۆشت و خوێن دروست کرابێت، بەڵکو لەگەڵ هێزی

ڕۆحی و ئەو بیرانەدایە کە لە تاریکیدا کار ئەکات و زاڵە بەسەر زۆرینەی ئەو کەسانەی کە پۆستی گرنگیان بەدەستەوەیە لە جیهاندا. هیچ هەست بەشەرم ناکەم .کاتێك کەدان بەوەدا دەنێم کە ئەوە کتێبە پیرۆزەکان بو کە ڕێگەیان پیشان دام تا بگەمە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوم.

کتێبی پیرۆز پێمان ئەڵێت – زۆربەشمان لە یادی ئەکەین – کە ئەهەریمەن یەکێك بوە لە زیرەکترین و بەتوانا ترین دانیشتوانەکانی بەهەشت و ڕۆحەکەشی ماوە و لەناو نەچوە. چۆن ئەهریمەن و پەیڕەوەکانی لە ڕێگەی خودا لایان داوە؟ ئەو خودایەی کە مافی زانین و خۆشەویستی دەبەخشێتە بونەوەرەکانی و جیهانێکی تەواومان پێ دەبەخشێ لە کاتێکدا کە بیرۆکەی ئەهریمەن لەسەر ئەوە دروست دەبێت کە دەڵێت ڕاستی و ماف هێزە و ئەو کەسانەش کە ژیرن مافیان بەسەر کەسانی دیکەوە هەیە، لەبەر ئەوەی جەماوەر نازانێت چی لە بەرژەوەندی دایە، ئەم بیروباوەڕەش وەك ئەبینین بە پێی زاراوەی هاوچەرخ پێی دەڵێن دەسەڵاتی ڕەها. تەوراتیش –سەردەمی کۆن– شتێك نیە جگە لە چیرۆکی ئەهریمەن کاتێك کە بو بە سەروەری جیهان و کارێکی کرد تا باپیرانمان لە سەر ڕێگەی ڕاست لابدەن و بەو پێیەش کە کڵێسای ئەهریمەن لەسەر زەوی دروست کرا، دواتر تەورات پێمان ئەڵێت کە چۆن ئەم کلێسایە کاری کردوە لەسەر پیلان گێڕان لە دژی خودا.

کاتێکیش مەسیح نێردرا بۆ سەر زەوی کە ئیدی پیلان گێڕان گەیشتبونە ئاستێك کە ئەهریمەن زاڵ ببو بەسەر تەواوی ئەو کەسانەی کە پۆستێکی گرنگیان هەبو لە جیهاندا... مەسیح کڵێسای ئەهریمەنی ڕیسوا کرد و هێرشی کردە سەر پەیڕەوانی کڵێسا و ناوی لێنان (نەوەی ئەهریمەن).مەبسیح بە دیاری کراوی بەم شێوەیە پێناسەی کڵێسای ئەهریمەن ئەکات بەوەی کە ئەوە ئەوانەن کە ناوی خۆیان ئەنێن جولەکە و دواتر ئەڵێت: ئەوانە درۆ ئەکەن و باوەڕ بە هیچ جۆرە ئاینێك ناکەن هەروەك چۆن پێناسەی ئەو گەورە سەرمایەدارانە ئەکات کە پارەیان ئەدا بەسو – ئەو کەسانە هاوتان لەگەڵ گەورە خاوەن بانکەکانی ئێستا – هەندێك کەس ناو لەو کەسانە ئەنێت جولەکە نورانیەکان...

(زۆرێك لە ئێمە لەیادیان کردوە کە مەسیح تەنها لەبەر ئەوە هاتۆتە سەر زەوی تا ڕزگارمان بکات لە داوی ئەهریمەن، ئەو داوەی کە تا دەهات زیادتر لە دەوری گەردنمان تەنگ و تەنگتر ئەبوەوە. سەروەرمان مەسیح ڕزگاری کردین کاتێك کە داوای لێکردین ڕو لە تەواوی گەلان بکەین تا ڕاستی پیلانەکەیان پێ بناسێنین).

*(ئینجیل یۆحەنا)*

هەروەها بەڵێنی پێدابین کە ئەگەر ئەوەی لێمان داواکراوە جێبەجێی بکەین، ئەوا زانینی ڕاستی ڕزگارمان ئەکات لەو پیلانە. بەڵام ئێمە ئەو ئەرکەمان پشت گوێ خست کە سەروەرمان مەسیح پێی سپاردین، ئەویش - زۆر بە ئاسانی - هۆکار بوو تا ئەو پیلانە لەو کاتەوە پەرەبستێنێت تاوای لێهات کە پێی نایە قۆناغی پێش کۆتاییەوە.

# زایۆنیزمی نـــوێ

## پیلانی نوێ لـه سـەرەتاوە
## تا ئەم سـەردەمەی ئێستامان

لە ساڵی ١٧٨٤ دەستی خواوەند گەمەکەی ئاشکرا کرد و بەڵگەی پێویستی خستە بەردەست حکومەتی باڤاریا[1] لەسەر بون و بەردەوامی پیلانێکی ئەهریمەنانەن . ئەوەی لە خوارەوەدێت وردەکاری ئەو ڕوداوەیە:

ئادەم وایزهاوبت کەسێکی مەسیحی و مامۆستای لاهوت و یاسای ئاینی بو لە زانکۆی ئانگۆلد شتات بەڵام لە مەسیحیەت هەڵگەڕایەوە و چوە سەر ئاینی ئەهریمەن. لە ساڵی ١٧٧٠ سوو خۆرەکان کە دواتر هەڵسان بە ڕێکخستنی دامەزراوەی ڕۆتشلد[2]بەکرێیان گرت بۆ پێداچونەوە و دوبارە ڕێك خستنەوەی ڕێکەوتن نامە[3] کۆنەکان لەسەر بنەمای نوێ، ئامانج لەم ڕێککەوتنانە ئامادەکارییە بۆ کڵێسای ئەهریمەن تا دەست بگرێت بەسەر جیهاندا و بیروبۆچونی ئەهریمەنان بسەپێنرێت بەسەر مرۆڤایەتی دا، ئەو مرۆڤایەتییەی کە هەر لە ئێستاوە ئامادەکاری بۆ ئەکرێت بۆ قبوڵ کردنی ئایدیۆلۆجیای

---

(١) باڤاریا تا ساڵی ١٨٧٠ یەیەکێك لە دەوڵەتە جرمانیە سەربەخۆ و گەورەکان دادەنرا، ساڵی ١٨٧٠ چوە ناو ئەو یەکێتی یەی کە بسمارك ڕایکەیاند.

(٢) خانەوادەی ڕۆتشل بە شای پارەی جولەکە دادەنرێت لە ئەوروپا، ئەم خانەوەدا جەولە زۆر دەوڵەمەندە دەستی گرتوە بەسەر لق گەلێکی زۆر گەوری پیشەسازی و بازرگانی و ئابوری.

(٣) ڕێککەوتننامەکانی دەسەلات دارانی جولەکە.

ئەهریمەن بە ڕەوش گەلێکی ئەهریمەنانە لە دوای دروست کردنی کارەسات گەلێکی کۆمەڵایەتی گەورە. وایزهاویت ئەرکەکەی بە جێگەیاند لە ١ مانگی مایسی ١٧٧٦.

ئەم نەخشەیەی کە وایزهاویت وێنەی کێشابو لەسەر بنەمای تێك شکاندنی تەواوی ئاینەکانی دیکە دروست کرابو، ئەکرێت بگەنە ئەم ئامانجە لە ڕێگەی دابەشکردنی (جویم)[٤]ەوە بەسەر سەربازگە گەلێکی ناکۆك بەیەکدی بۆ ئەوەی تا هەتا هەتایە لەگەڵ یەکدی لە ململانێدا بن لەسەر ژمارەیەك کێشەی سیاسی، ئابوری، ڕەگەز و کۆمەڵایەتی، ئەم پلانە وا ئەخوازێت کە دوای دروست کردنی سەربازگەکان ئەبێت چەکدار بکرێن، دواتر کار ئەکرێت لەسەر دروست کردنی ڕوداوێك کە بە هۆیەوە ئەم سەربازگانە ئەکەونە شەڕ لەگەڵ یەکدی دا و بەمەش لاواز دەبن و هەڵدەستن بە تێك شکاندنی حکومەت و دامەزراوە نیشتیمانی و یاسا ئاینیەکان.

لە ساڵی ١٧٧٦ وایزهاویت کۆمەڵەی (نورانییەکان)[٥]ی دروست کرد بۆ دەست کردن بە نەخشەی پیلان گێڕی (وشەی نورانی دەربڕینێکی ئەهریمەنانەیە کە مانا ڕاستەقینەکەی بریتیە لە (هەڵمەتی ڕوناکی). وایزهاویت پەنای بردە بەر درۆ و وتی کە ئامانجی ئەو گەیشتنە بە دەسەڵاتێکی جیهانی پێك هاتو لەو کەسانەی کە خاوەن توانایەکی بیری گەورە بن، ئەو کەسانەی دەسەلمێت کە خاوەن توانایەکی بەرزن لە بیرکردنەوەدا. بەم شێوەیە توانی نزیکی دو هەزار کەس لەخۆی کۆبکاتەوە لەوانەی کە سەرکەوتو بون لە بوارەکانی هونەر و وێژە و فێرکردن و زانست و ئابوری و پیشەسازی. هەر ئەو کاتەی کۆمەڵەی ڕۆژ هەڵاتەی گەورەی[٦] دامەزراند تا ببێتە ناوەندێك کە ئەو

---

(٤) ئەوە ئەو ناوەیە کە جولە ئەینێت لەسەر کەسێك کە جولەکە نەبێت.

(٥) هەروەك پێشتر وتمان (کەسە داناکانی جولەکە).

(٦). ناوەندی سەرەکی ماسۆنی و فەراماسۆنی.

کەسانە لە خۆ بگرێت کە خاوەنی ئەو پلانە نوێیەی[٧] وایزهاویتن کە دەبێت پەیڕەو بکرێت تا بتوانن بگەن بە ئامانج:

١. بەکار هێنانی بەرتیل، پارە و سێکس[٨] بۆ گەیشتن بە کۆنترۆڵکردنی کەسەکان بەتایبەت ئەو کەسانەی کە خاوەن پۆستن لە ئاستە جیاوازەکان و حکومەتە جیاوازەکاندا. کاتێکیش یەکێك لەو کەسایەتیانە ئەکەوێتە داوی نورانیەکانەوە لەهەمو لایەکەوە ئەبەسترێتەوە و بەکار ئەهێنرێت لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا لە ڕێگەی هەڕەشەی سیاسی و مایە پوچکردن و ئابڕوبردنی و تەنانەت لەناو بردنی خۆی یاخود خێزانەکەی.

٢. پێویستە لەسەر ئەو نورانیانەی کەوەك مامۆستا لە زانکۆ و پەیمانگا زانسیەکاندا کار ئەکەن بایەخ بدەن بە خوێندکارە زیرەکەکان بەتایبەت ئەوانەی کە سەر بە خانەوادەی دیارن تا پاڵیان پێوە بنێن ڕووە و نێونەتەوەیی جیهانی[٩]، دواتر بە شێوەیەکی تایبەت لەسەر بنەماکانی ئەو ڕێگەیە نێونەتەوەییە ڕاهێنانیان پێ ئەکرێت لە ڕێگەی پێدانی دەرفەت بۆ تەواوکردنی خوێندن لە زانکۆکانی جیهاندا و بەو شێوە بیری نێو نەتەوەیی لە مێشکیاندا ئەچەسپێنرێت لەبەروەی کە دروست بونی یەك حکومەت لە تەواوی جیهاندا

---

(٧). گرنبەستەکانی زایۆنیزمە کە وایزهاویت نوێی کردەوە و دوبارە ڕێك خستەوە.

(٨). ئەمە ئابڕوچونی بروفومیو وەزیری بەرگری بەریتانیای پێشومان بیر ئەخاتەوە کە لەگەڵ کچێکی هەرزە بەناوی (کریستین کیلر)، ئەو ئابڕوچونەی کە تەواوی بەریتانیای هەژاند. دوای ئەو ڕوداوە زنجیرەیەك ئابڕوچونی کەسایەتی بەریتانی دیکە دەرکەوت لەگەڵ کچانی کەم تەمەن و سۆزانی و دواتر دەرکەوت کە کەسایەتییەکی کۆمەلایەتی خاوەن پەیوەندی لە ئاستی بەرزدا کەناوی دکتۆر وارد ئەو پەیوەندییانەی ڕێك خستوە لە نێوان ئەو کەسایەتیانە و ئەو کچانەدا و ئانیستاش بە تەواوەتی پەردە لەسەر ئامانجی ئەو ئابڕوچونە هەلنەماڵراوە کە لە ساڵی ١٩٦٣ دا ڕی دا. ئەم ڕوداوە ئابڕوچونیی هاوشێوەمان بیر ئەخاتەوە کەلەکاتی شەڕی سویس ڕوی دا و پاریس و فەڕەنسای هەژاند، ئەویش ئەو ئابڕوچونە بو کە پاڵەوانەکەی مسیۆ لوتریکە بو کە سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی فەرەنسای پێشو و ژمارەیەك لە گەورە کەسایەتیە فەڕەنسیەکان بو، ئەم کەسانە شەوانە لەگەڵ چەند کچێکی هەرزەکاردا ڕایان دەبوارد. لەم دۆسیەیە و چەندین دۆسێی دیکەدا ئاماژەی پلانێکی ئەهریمەنانە دەردەکەوتن و تیایدا پیلان گێڕییەکی ئەهریمەنانەی جیهانی دەردەکەوێت کەلە تاریکیدا کار ئەکات.

(٩). نێونەتەوەی لێرەدا مەبەست لێی ڕێگە مرۆڤانەکە نییە بەڵکو ئەو مانایەی کە زایۆنیستەکان خۆیان مەبەستیانە لە چوارچێوە زاڵ بون بەسەر جیهاندا.

تەنها ڕێگەیە بۆ ڕزگار بون لە جەنگ و کارەساتەکان، سەرەتا باوەڕ بە خوێندکارەکان ئەهێنرێت و دواتر ئەو باوەڕە لە لایان ئەچەسپێنرێت کە کەسە خاوەن بەهرە تایبەتەکان ئەتوانن و ئەو مافەیان هەیە کە کەسانی زاڵ و بالادەست بن بەسەر ئەو کەسانەی کە کەمترن لەخۆیان لە ڕوی بەهرەی مێشك و زیرەکییەوە لەبەر ئەوەی جەماوەر نازانن چی باشە بۆیان لە ڕوی جەستەیی و بیر و ڕۆحییەوە...

ئەمڕۆکە لە جیهاندا سێ خوێندنگەی تایبەت هەیە کە تایبەت بەوە و دەکەوێتە:

أ. شاری غوردونستون لە سکۆتلەندا.

ب. شاری سالم لە ئەڵمانیا.

ج. شاری ئاناقریتا لە یۆنان.

شا فلیپ هاوسەری ئەلیزابیسی دووەم لە گۆردۆنستون خوێندی بە ئاسانکاری مامی لۆرد لویس مونتاتین کە لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە بوە فەرماندەی باڵای هێزی دەریایی بەریتانیا.

٣. بەندی سێهەم لە پلانەکەی وایزهاویت جەخت لەوە ئەکات کە ئەو ئەرکەی کە دەبێت بسپێردرێت بە کەسایەتییە خاوەن دەسەڵاتەکان دوای ئەوەی کە دەکەونە داوی نورانیەکانەوە و ئەو خوێندکارانەش کە مەشقی تایبەتیان پێ کراوە ئەوەیەکە کە وەك سەرچاوە بەکار بهێنرێن و بخرێنە پۆست گەلێکی هەستیارەوە وەك کەسانی پسپۆڕ و شارەزا بە شێوەیەك کە بتوانن ڕێنوێنی پێش کەش بکەن بە گەورە پیاوانی دەوڵەت بۆ ئاراستە کردنیان تا سیاسەت گەلێکی تایبەت پیادە بکەن و لە درێژ ماوەدا خزمەت بە پلانە نهێنییەکانی دروست کردنی جیهانێکی یەکتا بکات لە ڕێگەی نەهێشتنی تەواوی ئاین و ئەو حکومەتانەی کە تیایدا ئەو ئەرکەیان پێ سپێردراوە.

٤. پێویستە لەسەر نورانیەکان کە ڕۆژنامە و دەزگاکانی دیکەی ڕاگەیاندن کۆنتڕۆڵ بکەن لەبەر ئەوەی پێیان وایە کە دروست کردنی حکومەتێکی نەخوێندەوار تەنها ڕێگەیە بۆ چارەسەر کردنی کێشە جۆراوجۆرەکانی جیهان.

لەو ماوەیەدا فەرەنسا و بەریتانیا دو گەورە زلهێز بون لە جیهاندا واتە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم. ئەمەش پاڵی بە وایزهاویتەوە نا کە فەرمان بکات بە کۆمەڵەی نورانیەکان تا:

ا. شەڕی داگیرکارانە دروست بکەن بۆ ماندو کرنی بەریتانیا و ئیمپراتۆریەتەکەی.

ب. شۆڕشێکی فەرەنسی ڕێکبخەن بۆ ماندو کردنی فەرەنسا و ئەو شۆڕشەش لە ساڵی ١٧٨٩ دا هەڵگیرسا و نوسەرێکی ئەڵمانیش بە ناوی تسفاك ئەرکی ئەوەی پێ سپێردرا کە دەست نوسەکانی وایزهاویت کۆبکاتەوە لە شێوەی کتێبێك ئەویش بەو کارە هەڵسا و ناوی کتێبەکەی نا "تەنها دەست نوسە ڕەسەنەکان".

لە ساڵی ١٧٨٤ وێنەی ئەم بەڵگە نامەیە نێردرا بۆ نورانیەکان ئەوانەی کەلە لایەن وایزهاویتەوە نێردران بۆ فەرەنسا بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش. بەڵام هەورە بروسکەیەك دای لە هەڵگری نامەکە و لە ناوی برد ئەمەش هۆکار بو بۆ دۆزینەوەی ئەو بەڵگە خراپ کارییە لەلایەن پیاوانی ئاسایشەوە دوای پشکنینی جەستەی کەسەکە، دواتر ئەو بەڵگانە دران حکومەتی باڤاریا.

حکومەتی باڤاریا زۆر بە وردی لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر ئەو بەڵگە نامەیە و فەرمانی دا بە هێزەکانی ئاسایش بۆ داگیرکردنی کۆڕی "ڕۆژهەلاتی گەورە" کە بەم دواییانە وایزهاویت دایمەزراندبو. هەروەها پەلاماری ماڵی ژمارەیەك لە گەورە هاوبەشەکانی دا کە خاوەن کەسایەتی دیار بون لەوانە کۆشکە تۆکمەکەی باسوس لە ساندرسورف و تیایدا بەڵگەنامەی زیادتر دۆزرایەوە و حکومەتی هێنایە سەر ئەو بڕوایەی کە بەڵگە نامەی سەرەکی وێنەیەکە لە پیلانێکی کڵێسای جولەکە کەلەسەرەوە کۆنترۆڵی کۆمەڵەی نورانیەکان ئەکات بەئامانجی بەکارهێنانی جەنگ و نائارامی تا بە یەکێك لە ڕێگەکان دەوڵەتێك دابمەزرێنێت و زاڵ بێت بەسەر جیهاندا لە ڕێگەی دەست گرتن بەسەر توانا و ئامرازەکانی هێزدا.

بەم شێوەیە حکومەتی باڤاریا کۆڕی ڕۆژهەلاتی گەورەی داخست لە ساڵی ١٧٨٥ و کۆمەڵەی نورانیەکانی بەیاسا لادەر ناوزەند کرد و لە ساڵی ١٧٨٧ دەسەلاتی باڤاریا وردەکاری ئەو پیلانەی بلاو کردەوە و ناونیشانەکەشی بریتی بو لە "نوسینە سەرەکییەکانی ئاینزا و ڕێکخراوی نورانیەکان" و وێنەیەکی ئەو بەڵگە نامەیەی نارد بۆ گەورە پیاوانی دەوڵەت و کلێسا.بەلام بەهێزی نورانیەکان بە ئەندازەیەك بو کە وای کرد گوێ بەو هوشدارییە نەدرێت هەر وەك چۆن پێشتریش گوێ بە هۆشدارییەکانی مەسیحیش نەدرا.

لەو کاتەوە چالاکی نورانیەکان سروشتێکی نهێنی بەخۆوە گرت و وایزهاویت ڕێنمایی دا بە پەیرەوەکانی تا بچنە ناو ڕیزی کۆمەڵە ماسۆنیە نهێنیەکان کە پێیان دەوترا ماسۆنیە شینەکان و تیایدا کۆمەڵەیەکی نهێنی دروست بکەن لەناو دڵی ئەو کۆمەڵە نهێنیانە کە ئەرکی بریتی بو لە وتنەوەی وانەی نێونەتەوەیی بەو ماسۆنیانەی کە ئامادەیی دەر دەبڕن بۆ دابڕان لە هەر بیرۆکەیەکی ئاینی، نورانیەکان ماسکی چاکە و چاکەخوازیان بەکار دەهێنا بۆ شاردنەوەی چالاکییە تێکدەرەکەیان. کاتێکیش کە ویستیان ئامادەکاری بکەن بۆ کۆڕی ماسۆنیەکانی بەریتانیا "جۆن ڕۆبنسۆن" یان بانگهێشت کرد بۆ سەردان کردنی دەوڵەتە ئەوروپیەکان، ڕۆبنسۆن یەکێك بو لە گەورە ماسۆنیەکانی ئسکوتلاندا و مامۆستای فەلسەفە بو لە زانکۆی ئەدینبۆرگ و ئەمینداری گشتی کۆمەڵەی شاهانە بو لە ئەدینبۆرگ پایتەختی ئوسکتلەندا. بەلام ئەو فریو کاریەیان بۆ نەچوە سەر و ڕۆبنسۆن باوەڕی بەوە نەکرد کە ئامانجیان تەنها دروست کردنی دیکتاتۆریەتێکی بچوك بێت، بەلام لەهەمان کاتدا هەستی خۆی پاراست و باسی لێوە نەکرد و لەهەمان کاتدا نورانیەکان وێنەیەکی پاکنوس کراوی پیلانگێڕییەکەی وایزهاویت یان پێدا تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات و بیپارێزێت. ساڵی ١٧٨٩ شۆڕشی فەرەنسا هەڵگیرسا لەبەر ئەوەی کە پیاوانی دەوڵەت و کلێسا ملکەچی ئەو ڕێنماییانە بون کە ئاراستەیان کرابو و لە هەمان کاتیشدا گوێیان بە هۆشدارییەکان نەدابو، هەر بۆیە ڕۆبنسۆن ترسا لەوەی کە ئەو مەترسیە ولاتانی دیکەشی بگرێتەوە.

ساڵی ١٧٩٨ کتێبێکی بڵاوکردەوە ناوی نا پیلانگێڕی گەورە بۆ نەهێشتنی تەواوی حکومەت و ئاینەکان[١٠] بەڵام ئەم هۆشدارییەش هەروەك زۆرینەی هۆشدارییەکانی دیکەی پێشو گوێی پێنەدرا.

تۆماس جێفرسۆن "یەکێك لە دامەزرێنەران وسەرۆك کۆماری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا" بو بە قوتابیەکی وایزهاویت و بو بەیەکێك لە گەورە داکۆکی لێکەرانی کاتێك حکومەتی وڵاتەکەی وەك لە یاسا لادەرێت ناوزەندی کرد. هەر لە ڕێگەی جێفرسۆنەوە نورانیەکان هاتنە ناو کۆڕی ماسۆنیە نوێکانەوە لە نێو ئنفلاند ئەو ناوچەیەی کە ژمارەیەك لە ویلایە سەرەکیەکانی ئەمەریکا لە خۆ ئەگرێت .

لە ساڵی ١٧٨٩ جۆن ڕۆبنسۆن هۆشداری دایە سەرۆکی ماسۆنیەکان لەوەی کە چیدی نورانیەکان نەخزێنە ناو کۆڕەکانیانەوە. لە مانگی تەموزی ساڵی ١٧٩٨ داڤید بابلان سەرۆکی زانکۆی هارڤارد هەمان هۆشداری دوبارەکردەوە و ئاڕاستەی دەرچوانی کرد و هەژمونی پو لە زیادبوی نورانیەکانی بۆ ڕون کردنەوە لە نێوەندە سیاسی و ئاینییەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

جۆن کوینسی ئادامز کۆڕە ماسۆنیەکانی لە نیو ئنفلند (بەریتانیای نوێ) ڕێك خست و بڕیاری دا ساڵی ١٨٠٠ خۆی کاندید بکات بۆ سەرۆکایەتی کۆمار لە دژی جێفرسۆن و بۆ ئەو کارە هەستا بە نوسینی سێ نامە بۆ کۆلۆنێل ولیام ئستۆن و تیایدا باسی لە چۆنیەتی بەکارهێنانی کۆڕەکانی ماسۆنی کردبو بۆ ئامانجی تێکدەرانە. تا ئێستەش ئەو نامانە پارێزراوە لە کتێبخانەی دیتنبۆرگ سکوێر لە شاری فیلادلفیا.

لە ساڵی ١٨٢٦ کاپتن ولیام مۆرگان پێی وابو کە ئەرکەکەی وا ئەخوازێت کە قسە بکات بۆ ڕای گشتی و ماسۆنیەکانی دیکە لە بارەی ڕاستی و پلانی نهێنی و ئامانجی کۆتایی نورانیەکان، لە بەرامبەردا نورانیەکان کەسێکی خۆیان ڕاسپارد کە ئینگلیزی بو بە ناوی "ڕیتشارد هاوارد" تا بڕیارەکەیان جێبەجێ

---

[١٠] ئەم کتێبە ئەو کاتە لە لەندە چاپ کرا و تا ئیستاش هەندێك مۆزەخانە وێنەیەکی لەلا ماوە و لە وڵاتە

بکات کە بریتی بو لە کوشتنی لەبەر ئەوەی ناپاکی بەرامبەر کردون، کاپتن مۆرگان هەستی بە مەترسی کرد لە سەر ژیانی هەر بۆیە بڕیاری دا کە بەرەو کەنەدا هەڵ بێت، بەڵام هاوارد توانی بیگاتێ لە نزیك ستور و لە دۆڵی نیاگارە تیرۆری کرد، لە نیۆیۆرك توانرا کەسێك بدۆزرێتەوە "ئافری ئالن" کە سوێندی خوارد گوێی لە هاوراد بوە کە ڕاپۆرتێکی پێشکەش کردوە لە کۆبونەوەی کۆمەڵەیەکی نهێنی لە نیۆیۆرك و ناوی لێناوە "سوارچاکانی پەرستگا" بەناوی ڕێکخراوی خاچپەرستەکان کەلە سوریا دامەزرا لە کاتی شەڕی خاچ پەرستەکان و لەو ڕاپۆرتەدا ڕونی کردۆتەوە کە چۆن بڕیاری لە سێدارەدانی لەسەر کاپتن مۆرگان جێبەجێ کردوە.دواتر ڕێوشوێن گیرایە بەر بۆ گواستنەوەی بکوژەکە بۆ دور لە بەریتانیا، تا ئەمڕۆکەش کەم کەس ئەزانێت کە ئەم ڕوداوە ئەو کاتە بوە هۆی تورە بونی ٤٠٪ ماسۆنیەکان لە باکوری ویلایەتەکانی ئەمەریکا و بوە هۆی واز هێنانیان لە ماسۆنیەت – نوسراوێکی وتاربێژی کۆبونەوەیەکی گەورەم لەلایە کە ئەو کاتە بەسترا لەسەر ئەو ڕوداوە – لێرەوە ئەتوانین ڕێژەی هەژمونی ئەو کەسانە وێنا بکەین کە دەستیان هەبوە لەو پیلان گێڕانە ئەهریمەنانەیە،لەسەر دەسەڵاتی ئەو کەسانە ئەوەندە بەسە کەبزانین چۆن توانیویانە لە ڕێگەی سەرچاوەکانیانەوە ڕوداو گەلێکی زۆر دیار لەو مێژوە لابدەن[11] و دەری بکەن لەو کتێبانەی کە ئێستا لە خوێندنگەکانی ئەمەریکا ئەخوێنرێت.

لە ساڵی ١٨٢٩ نورانیەکان کۆنگرەیەکیان لە نیۆیۆرك بەست و نورانییەکی ئینگلیزی بە ناوی (رایت) بانگهێشت کرا و تیایدا ڕاگەیەندرا کە کۆمەڵەکەیان بڕیاری داوە جوڵانەوە نهلستیەکان (ئانارشیستەکانی ڕوسیا و ئەوروپای ناوەند لە سەدەی ڕابوردودا) و جوڵانەوە بێ باوەڕەکان بگرێتە خۆ لە ڕێکخراوێکی جیهانی کە پێی دەوترا کۆمۆنیزم. ئامانج لەم مێژە وێرانکاریەی

(11) ئەو کەسانەی کە لەو ڕوداوانەدا باس کراوان (جیفرسۆن، جۆن کوینسی ئادامز، داڤید بابلان، کۆنۆلێل ولیام ئاستون و کاپتان ولیام مۆرگان) ئەم کەسانە تێکڕایان کە سانی بەرجەستە و دیار بون لە مێژوی ئەمەریکادا و دوان لە کورەکانیشیان بونە سەرۆك کۆمار.

که ئەم ڕێکخراوە ئەبێتە خاوەنی بریتی بو لە ئاسانکاری کردن بۆ کۆمەڵەی نورانیەکان تا بتوانن شەڕ و ئائارامی دروست بکەن لە داهاتودا.

بۆ دامەزراندنی ئەو پرۆژە ترسناکە سێ کەس دیاری کرالەلایەن هەر یەك لە کلینتۆن ڕۆزفێلت، باپیری فرانکلین ڕۆزفێلت سەرۆکی وڵاتە یەکگتروەکانی ئەمەریکا، راس گریلی و شاس. ئەم لیژنەیە پارەیەکی زۆری کۆکردەوە بۆ پشتیوان کردنی ئەو پرۆژەیە. هەر ئەو پرۆژەیە هاوکاری هەر یەك لە کارڵ مارکس و ئەنجلزی کرد تا کتێب گەلی (سەرمایە، مانیفێست) لە شەقامی سوهۆ لە لەندەن بنوسن.

ساڵی ١٨٣٠ وایزهاویت کۆچی دوایی کرد دوای ئەوەی کە وا باس کرا کە تۆبەی کردووەو گەڕاوەتەوە باوەشی کلێسا. ئەرکی نورانیەکان بە پێی ئەو پلانەی کە وایزهاویت دایڕشتبو بۆ پیلانگێری جولەکە زۆر کۆنە کە بریتیە لە ڕێکخستن و ئاڕاستەکردنی دەسەلات لە سەرجەم ڕێکخراو و کۆمەڵە جیهانیەکان لە ڕێگەی گەیاندنی سەرچاوەکانیان بە پۆستە گرنگ و هەستیارەکان. لەو کاتەی کە کارڵ مارکس لە ژێر چاودێری کۆمەڵێك لە نورانیەکان مانیفێستی ئەنوسی، پرۆفیسۆر (کارك ریتەر) کە مامۆستای زانکۆی فرانکفۆرت بو تیۆرەی پێچەوانەی کۆمۆنیزمی ئەنوسی —لە ژێر چاودێری کۆمەڵێکی دیکە لە نورانیەکان – هەروەك چۆن لە داهاتودا بەر ئەکەوێت، سەرکردەکانی پیلان گێڕی جیهانی ئەتوانن هەردو تیۆرە پێچەوانەکە بەکار بهێنن بە جیاوازییەکانیانەوە لە پێناو دروست کردنی دوبەرەکی لە نێوان گەلاندا تا ئەو ئاستەی کە مرۆڤایەتی دابەش ببێت بەسەر دو سەربازگەی دژ بە یەك... ئەمەش ئامادەکاری ئەکات بۆ قۆناغی دواتر ئەویش پرچەك کردنی هەردو سەربازگەکە و هاندانیان تا یەکتری لەناو ببەن... ئەوەی کە رایتەر دەستی پێکرد فەیلەسوفێکی دیکەی ئەڵمانی تەواوی کرد بەناوی (فریدریك نیتشە) کە ڕێبازەکەی ناسراوە بە (نیتشەییزم) یاخود فەلسەفەی نیتشە... ئەم ڕێبازەش بوە بنەما بۆ دروست بونی بیری فاشیزم و نازیزم... هەر ئەم سێ بیروبۆچونە بو کە ڕێگەی دا بە نورانیەکان تا لە ڕێگەی سەرچاوەکانیانەوە

هەردو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی هەڵ بگیرسێنن. ساڵی ١٨٣٤ نورانیەکان (مازینی) سەرکردەی شۆڕشگێڕی ئیتالی بەناوبانگ هەڵ ئەبژێرن تا جێبەجێ کاری پرۆگرامەکەیان بێت و نائارامی لە جیهاندا دروست بکات... مازینی لەم پۆستەدا مایەوە تا کاتی مردنی لە ساڵی ١٨٧٢.

لە ساڵی ١٨٤٠ جەنەراڵێکی ئەمەریکی بە ناوی ئەلبێرت بایك[١٢] هاتە لای و ئەوەندەی ئەبردگەوتە ژێر کاریگەریی مازینییەوە. ئەو کاتە جەنەراڵ بایك زۆر بە گلەیی بو لەبەر ئەوەی سەرۆکی ئەمەریکا ئەو هێزە هندییانەی مەرەخەس کردبو کە پەیوەست بون بە سوپای ئەمەریکاوە بەهۆی ئەوەی لەژێر پەردەی کاریسەربازی تاوانی گەورەیان ئەنجام دابو، هەر بۆیە جەنەراڵ بایك بیرۆکەی نێونەتەوایەتی جیهانی قبوڵ کرد لە ژێر دەسەلاتی یەك حکومەت تەنانەت دواتر بوە یەکێك لە سەرکردە ڕۆحیەکانی پیلان گێڕی جیهانی. لە نێوان ساڵەکانی ١٨٥٩ تا ١٨٧٠ ووردە کاری پلانێکی سەربازی تێر و تەسەلی دانا بۆ سێ شەڕی جیهانی و سێ شۆڕشی گەورە کە بەپێی بڕوای ئەو لە سەدەی بیستەم دا ئەبنە هۆی ئەوەی کە پیلان گێڕییەکە بگاتە قۆناغی کۆتایی.

جەنەراڵ بایك زۆرینەی کارەکانی لە کۆشکەکەی ئەنجام دەدا ئەو کۆشکەی کەلە لیتا روك[١٣] پایتەختی ویلایەتی ئەرکنساب دروستی کرد و پێك هاتبو لە سیانزە ژور، کاتێك کە نورانیەکان و کۆڕی ماسۆنیەکان (کۆڕی ڕۆژهەلاتی گەورە) بونە جێگەی گومان لەبەر چالاکیە شۆڕشگێڕییە بەرفراوانەکەی مازینی لە سەرتاسەری ئەوروپا، جەنەراڵ بایك ئەرکی دوبارە ڕێك خستنەوەی ماسۆنیەتی لەئەستۆ گرت بە پێی بنەما گەلێکی ئاینی نوێ، بۆ ئەو کارە هەڵسا بە دروست کردنی سێ ئەنجومەنی باڵا، نێوەندی یەکەمینیان ئەکەوتە شارلستۆن لە ویلایەتی کارۆلینای باشور لە وڵاتە یەککرتوەکانی ئەمەریکا، نێوەندی دووەم ئەکەوتە ڕۆما و نێوەندی سێهەم ئەکەوتە بەرلین. ئەرکی

---

([١٢]) یەکێك لە گەورە سەرکردە سەربازییە ئەمەریکیەکان لە سەدەی ڕابوردو.

([١٣]) ئەم شارە دواتر ناوبانگ پەیدا ئەکات واتە لە ساڵی ١٩٥٧ وەك نێوەندێکی سەرەکی ڕەگەز پەرستی لە وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا و وەك یەکێك لە نێوەندەکانی ناارامی شاراوە تیایدا.

ئەوەش بە مازینی سپێردرا کە بیست ئەنجومەن دروست بکات کە سەر بەوان بێت و لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوببێتەوە (لەو کاتەوە تا ئێستا ئەو ئەنجومەنانە بۆتە نێوەندی سەرکردایەتی گشتی نهێنی بۆ پیلان گێڕی جیهانی).

زانا نورانیەکان بەر لەوەی زانا مارکۆنی ڕادیۆ و بێ سیم بدۆزێتەوە، ئامرازی پەیوەندی کردنیان لە نێوان جەنەڕاڵ بایك و سەرۆکی ئەنجومەنە ئاماژە پێکراوەکان ڕێك خست... دواتر دەزگای هەواڵگری ئەمەریکا بەو نهێنیەی زانی ئەوەش وای لێکردن کە درك بەوە بکەن چۆن ڕوداو گەلێکی بە ڕو کەش لێك جیا کە لە گۆشە و کەناری جیهان ڕو دەدات لە یەك کاتدا، ئەبێتە شەڕ و نائارامی دروست کردنی دۆخ گەلێکی ترسناك.

پلانەکەی جەنەڕاڵ بایك لەیەك کاتدا سادە و کاریگەر بو، هەروەك چۆن ڕوداوەکان دەریان خست... ڕێکخستنی جوڵانەوە جیهانیەکان پێویستی بەم سێ خاڵەیە:

أ. کۆمۆنیزم.

ب. نازیزم (هەڵقوڵاو لە تیۆریەکانی نیتشە).

ت. زایۆنیزمی جیهانی.

هەروەها جوڵانەوە گەلێکی جیهانی دیکە وەك ئامادە کارییەك بۆ هەڵگیرساندنی سێ شەڕی جیهانی و سێ شۆڕشی گەورە... ئامانج لە شەڕی جیهانی یەکەم ڕەخساندنی دەرفەت بو بۆ نورانیەکان تا کۆتایی بەدەسەڵاتی قەیسەرەکان بهێنن و بیکەنە پێگەی جوڵانەوە کۆمۆنیزمە – بێ باوەڕەکان، ئامادە کاری کرا بۆ ئەو شەڕە لە ڕێگەی ناکۆکیەکانی نێوان هەردو ئیمپراتۆریەتی بەریتانی و ئەڵمانی، ئەو جیاوازیانەی کە هەر لە سەرەتاوە نورانیەکان لە نێوان ئەو دو دەوڵەتەدا دروستیان کردبو. دوای کۆتایی هاتن بە جەنگی جیهانی یەکەم و دامەزراندنی کۆمۆنیزم وەك ئایین، بەکار هات بۆ وێرانکردن و ڕوخاندنی حکومەت و باوەڕە ئاینیەکانی گەلان،لە جەنگی جیهانی دووەمیشدا ناکۆکی نێوان فاشیەکان و جوڵانەوەی زایۆنی

سیاسی[١٤] دەرفەتی بۆ ئەو کارە ڕەخساند، ئامانج لەم شەڕە ئەوە بو کە کۆتایی بە نازیزم بهێنرێت و دەسەڵاتی زایۆنیەکان لە ڕوی سیاسیەوە زیادتر بێت تا ئەو کاتەی کە بتوانن دەوڵەتی ئیسڕائیل لە فەڵەستین دروست بکەن. یەکێکی دیکە لە ئامانجەکانی ئەم پلانە بریتی بو لە پشتیوانی کرنی کۆمۆنیزمی جیهانی تا ئەگاتە قۆناغی هاوتابونەوە لەگەڵ هێزی تێکڕای جیهانی مەسیحی ڕۆژئاوا. کاتێك کە کۆمۆنیزم هێزەکەی ئەگاتە ئەو ئاستە ئەوەستێنرێت و دەست دەکرێت بە جێبەجێکردنی قۆناغی دواتر کە بریتیە لە ئامادەکاری کردن بۆ کارەساتی مرۆڤایەتی و گەردونی سێ هەم و کۆتایی... من لێرەدا ئەپرسم ئایا هەر کەسێکی بەئاگا ئەتوانێت ڕۆڵی ڕۆزفێلت و تشێرشڵ نادیدە بگرێت لە جێبەجێ کردنی ئەو پلانەدا؟... ئەگەینە جەنگی جیهانی سێهەم – داهاتو – ئەم جەنگەش کە لە دەرەنجامی ئەو ململانێیەی کە نورانیەکان پلانیان بۆ کێشابو – سەرۆکەکانی پیلانگێڕی زانیۆنیزمی جیهانی – لە نێوان زایۆنیزمی سیاسی و جیهانی ئیسلامیدا ڕو دەدات[١٥].ئەو پلانەش وا دەخوازێت کە لە ڕێگەیەوە جیهانی عەرەبی و دواتر ئیسلام تێك بشکێنرێت. بەم شێوەیە وڵاتانی جیهان بە ناچاری خۆی دەبینێتەوە کە دابەش بوە بەسەر دو سەربازگەدا و کار دەکات بۆ گەیشتنەوە بە یەك تا ئیدی جیهان ئەگاتە پلەی ماندوبونی ڕەها: لە ڕوی جەستەیی و بیر و ڕۆح و ئابورییەوە... جارێکی دیکە ئەپرسم:

ئایا کەسێکی بێ لایەن و ژیر ئەتوانێت ئەو پیلانگێڕییە شاراوانەی کەلە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی دور ئەگوزەرێ ڕەت بکاتەوە کە بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ کار ئەکەن بۆ گەیشتن بە دەرەنجامێکی ئەهریمەنانە.

لە ساڵی ١٨٧١ ەوە و بە تایبەت ١٥ ئابی ١٨٧١ جەنەڕاڵ بایك بە مازینی ئەڵێت کە ئەوانەی کار ئەکەن بۆ گەیشتنە دەسەڵات بە شێوەیەکی ڕەها هۆکار

---

([١٤]) هەروەك پێشتر باسی لێوە کرا مەبەست لە زایۆنیزمی سیاسی ڕوکەشی دەرەکی چالاکی جوڵانەوەی زایۆنیزمی جیهانیە.

([١٥]) بە گشتی ڕۆژئاواییەکان جیهانی ئیسلامی لە بری جیهانی عەرەبی بەکار ئەهێنن.

ئەبن لە دوای دروست بونی جەنگی جیهانی سێ هەم بۆ دروست بونی گەورەترین کارەسات کە مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینیبێتی، ئەوەی لە خوارەوە دێت بابەتێکە لەو نامەیە وەرگیراوە کە پارێزراوە لە مۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن:

(جولانەوە ئانارشیستیەکان ئەبەستینەوە بە جولانەوە بێ باوەڕەکان و کار ئەکەین لەسەر دروست کردنی کارەساتێکی مرۆیی کە قێزەونییە بێ کۆتاییەکەی بۆ تەواوی میللەتەکان وەك دەرەنجامی بێ باوەڕی ڕەها[١٦] دەردەکەوێت و تیایدا سەرچاوەی وەحشیگەری و لەرزەیەکی خوێناوی گەورە ئەبینن. ئەو کاتە هاولاتیانی تەواوی نەتەوەکان ئەبینن کە ناچارن پارێزگای لە خۆیان بکەنلە بەرامبەر ئەو کەمینەیەی کە بانگەشەی شۆڕشی جیهانی ئەکەن و ئەکەونە خۆیان بۆ لەناو بردنی ئەو کەسانەی کە شارستانیەت ئەڕوخێنن... ئەو کاتە جەماوەرە مەسیحیەکان ئەبینن کە بیرۆکەکەیان ون و بێ مانا ئەبێت و ئەو جەماوەرەش پێویستی زۆر ئەبێت بۆ هەر بیرو باوەڕێك کە بی پەرستێت، ئەو کاتە ڕوناکی ڕاستەقینە یەك ئەگرێت.. بە باوەڕی ئێمە – بۆچونی نورانیە ئەهەریمەنییەکان ئەبێتە دیاردەیەکی جیهانی و بە شێوەیەکی ئاشکرا پێشکەش بە جەماوەر ئەکرێت... لە دایك بونی ئەم دیاردەیە وەك دەرەنجامێك دەبێت بۆ ڕای گشتی جەماوەر کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دوای نەمانی مەسیحیەت و بێ باوەڕی دێت[١٧] لە یەك کاتدا)..

مازینی لە سالی ١٨٧٢ کۆچی دوایی کرد و جەنەڕاڵ بایك سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی دیکەی ئیتالی خستە شوێنە کە ناوی لومیی بو. دوای مردنی لومیش لینین و ترۆتسکی جێگەیان گرتەوە... پشتیوانی کەرانی دارایی ئەو چالاکیانەش خاوەن بانکی جیهانی بون لە بەریتانیا و فەڕەنسا و ئەلمانیا و ولاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا... ئەبێت هەمیشەش ئەوە بلێین کە خاوەن بانکە جیهانیەکان ئەمڕۆکە هەر خۆشیان سوخۆرەکانی سەردەمی مەسیحن،

---

(١٦) مەبەستی نوسەر بێ باوەڕی ڕەها و کۆمۆنیزم بە شێوەیەکی تایبەت.

(١٧) مەبەستی نوسەر لە مەسیحیەت و بێ باوەڕی هەردو شارستانیەتی ڕۆژئاوا و کۆمۆنیزمە.

ئێستەش هەروەك پێشو سەرچاوەی نورانیەکانن،واش خراوەتە بیری جەماوەرەوە کە کۆمۆنیزم جولانەوەیەکی کرێکارییە کە دروست بوە بۆ ڕوخاندنی سەرمایەداری. بەلاَم ئێمە لەم کتێبەدا ئەیسەلمێنین کە ئەمە (بەردگەلێکە لەسەر تەختەی شەترەنج)، پێشتریش ئەمە سەلمێنراوە لە کتێبی "تەمێك بەسەر ئەمەریکاوە".

بەو مانایەی کە هەوالگری لە هەر یەك لە ولاَتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا بەلَگە گەلێکی یەکلاکەرەوەی دەست کەوتوە کە ئەیسەلمێنێت هەر سەرمایە دارە جیهانیەکان بون کە پشتیوانی داراییان دەکرد لە هەردو سەربازگە دژە بەیەکەکە لە سەرجەم شەڕ و شۆڕشەکاندا لە سالَی ١٧٧٦ەوە... ئەویش لە ڕێگەی دامەزراوە داراییەکانیان کەلەسەرتاسەری جیهاندا بلاَو بۆتەوە.

لایەنگرانی کلَێسای ئەهریمەنی – واتە جولەکە – لەم سەردەمەی ئێستاماندا ئەوە ئەوانن کە حکومەتەکان ئاڕاستە ئەکەن لە ڕێگەی پێدانی قەرز و سو و ناچاری ئەکەن کە بەشداری بکات لە شەڕەکاندا بە ئامانجی بە دی هێنانی پلانەکانی جەنەڕالَ بایك کە ئامانجی گەیاندنی جیهانە بە ئاستێك لە پیلان گێڕی کە تیایدا بتوانن کۆمۆنیزم و مەسیحی یەکان ناچار بکەن کە لەگەلَ یەکدا دەرگیر ببنلە شەڕێکی لەناوچونی سەرتاسەری دا. پیلانگێڕییەکەی جولەکە ئەلَێت کە پێویستە هەرنەتەوەیەکی دیکە بە پێی ئەو پلانەی کە دانراوە بەشداری ئەو شەڕە بکات کە بە پێی پێوەر دیاری کراوە...

بەلَگە گەلێکی دیکەی زۆر هەن کە دەیسەلمێنن بە شێوەیەکی یەکلا کەرەوە جەنەڕالَ بایك بە نۆبەی خۆی سەرکردەی ئەو پیلانگێڕییە جیهانیە بو وەك وایزهاویت لە سەردەمەکەی خۆی،[١٨] واتە وەك ئەو کەشیشی گەورەی ئەو هۆنراوە ئەهریمەنانەیە. جگە لەو نامەیەی کە بۆ مازینی نارد، نامەیەکی

---

(١٨) وەك پێشتر باسمان لێوە کرد یەکێك بو لە گەورە سەرکردە سەربازییە ئەمەریکیەکان لە ماوەی سەدەی ڕابوردو.

دیکەی نارد کە کەوتە دەست کەسانی بێگانە و ئەو نامە نوێیەش ئاراستەی کۆڕەکانی ماسۆنی کرابو، ئەو کۆڕانەی کە خۆی ڕێکخەری بو.لە دوتوێی ئەو نامەیەی کە لە ١٤ تەموزی ١٨٨٩ ئاراستەی کردبو هاتوە کە دەڵێت: "پێویستە بە جەماوەر بڵێین کە ئێمە باوەڕمان بە خوداوەند هەیە و ئەیپەرستین بەڵام ئەو خودایەی کە ئێمە دەیپەرستین وەهمو ترسی دەرونی لێمان دور ناخاتەوە... پێویستە لەسەر ئێمە کە گەیشتوینەتە ئاستەکانی ئاگایی والا بیروباوەڕی خۆمان بپارێزین کە تیایدا ئەهریمەن خواوەندە... بەڵێ ئەو خواوەندە بەڵام خواوەندیش خوایەکی دیکەیە لەبەر ئەوەی ناکرێت بە شێوەیەکی ڕەها تەنها دو خوا هەبێت کە ڕو بەڕوی یەك بن... ئێمە ئەهریمەن بە بێباوەڕ دادەنێین بەڵام ڕاستی فەلسەفی پەتی ئەوەیە کە خواوەند و ئەهریمەن هەردوکیان یەکسانن... بەڵام ئەهەریمەن خواوەندی ڕوناکی و خێرە و هەتا هەتایە لە پێناو مرۆڤایەتی دا دەجەنگێت لە دژی خواوەند کە خوای تاریکی و خراپەیە".

بانگەوازێك بۆ جیهانی مەسیحی:

ئەو پروپاگەندەیەی کە لە ناو جەماوەردا بڵاو کراوەتەوە لە لایەن ئاراستەکەرانی پیلانگێڕی جولەکەی ئەهریمەنانە ئەو جەماوەرەی هێناوەتە سەر ئەو باوەڕەی کە نەیارەکانی مەسیحیەت تێکڕایان بێ باوەڕن... بەڵام لە ڕاستیدا ئەم درۆیە مەبەستێکی لە پشتەوەیە و ئامانج لێی بڵاوکردنەوەی پەردەپۆشکردنی پلانە نهێنیەکانی قەشەی ئاینی ئەهریمەنانەیە ئەوانەی کە سەرپەرشتی کڵێسای جولەکە ئەکەن و ئاراستەی ئەکەن بە شێوەیەك کە بتوانن لەگەڵی دا ڕێگری بکەن لە مرۆڤایەتی کە ڕێگەی خودا لەسەر زەوی پیادە بکات... ئەو قەشانە لە تاریکیدا کار ئەکەن و هەمیشە لە پشت پەردەوە دەمێننەوە و پارێزگاری لە نهێنی ئامانج و کەسایەتیەکانیان ئەکەن و لە زۆرینەی ئەشارنەوە لەوانەی کە گومڕا بون و بون بە گەمەیەك بە دەستیانەوە، قەشە جولەکەکان ئەزانن کە سەرکەوتنی کۆتایی پیلانگێڕیەکەیان ئامانجی

داگیرکردنی دەسەڵاتە لە تەواوی وڵاتانی جیهان. ئەوەش ئەوەستێتەوە لەسەر توانایان لەسەر پاراستنی نهێنی کەسایەتی و ئامانجە تایبەتەکانیان تا ئەو کاتەی ئەو ڕۆژە دێت کە هیچ هێزێك و هیچ ژیرییەك نەتوانێت ڕێگریبام لێ بکات کە سەرکردەیەکی ڕەهای ستەمگەر بۆ تەواوی جیهان دابنێن.

هەندێك لە ئایەتەکانی کتێبی پیرۆز (ئنجیل) پێمان ئەڵێت کە هەندێك لە نەخشەکان وەك نەخشەکانی وایزهاویت و بایك جێبەجێ ئەکرێن تا ئەو ڕۆژە دێت کە هێزەکانی خراپە دەست دەگرن بەسەر زەوی دا... یەکێك لەو ئایەتە ئەهریمەنانەیە ئەڵێت: دوای ئەوە بۆ ماوەی هەزار ساڵ دەست دەگیرێت بەسەر زەوی دا... من ناڵێم ئەم ئایەتە چی ئەگەیەنێت ئەو کاتە بە پێی پێوەرە مرۆڤانەکانمان بەڵام ئەوەی ئەتوانم بیڵێم ئەوەیە کە بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەی من کە لەسەر پیلانگێڕی ئەهریمەنانە کردومە بۆم دەرکەوتوە – بە پێی ئەوەی کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتوە– دەسەڵاتی هێزی خراپە بەسەر جیهانی ئێمەدا زودتر لە پێشبینی کتێبی پیرۆز و لە ماوەیەکی زۆر کورت تر ڕوی دا.

پێویستە بە پێی توانا تەواوی گەلان لەو پیلانگێڕییە ئاگادار بکرێتەوە لەبەر ئەوەی ڕەنگە جەماوەر بە تەواوی ڕاستیەکە نەزانێت، لێکۆڵینەوەکان لە نامەکانی مازینی و قەشەکانی پیلانگێڕی جولەکە دەریان خستوە کە بەردەوام هەوڵیان داوە نهێنی کەسەکانی خۆیان و ئامانجە ڕاستەقینەکانیان بپارێزن، ئەوەی کەلە خوارەوە دێت هەڵبژاردەیەکە لەو نامەیەی کە مازینی نوسیویێتی بۆ هاوکاری کردنی دکتۆر برایدا نشتایین بەر لە مردنی بە چەند ساڵێك: ئێمە کۆمەڵەیەکی برایانە پێك ئەهێنینو سەرتاسەری گۆی زەوی بڵاو ئەبینەوە، ئێمە ئەمانەوێت هەرچی بەربەستە لە نێوان خۆماندا بیشکێنین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەربەستێکی تەنك هەیە لە نێوانماندا کە هەر یەکەمان دادەپۆشێت و کەس هەستی پێ ناکات سەربای ئەوەی کە قورسایی دروست ئەکات لەسەرمان... کەی ئەو بەربەستە لائەبرێت؟ لە کوێ یە؟ کەس وەڵام نازانێت، یاخود لانی کەم کەس هیچ لە بارەیەوە ناڵێت... کۆمەڵەکەمان نهێنییە تەنانەت بۆ ئێمەی شارەزا و دێرین تیایدا.

له ساڵی ١٩٢٥ کاردینالْ کارۆ ئای رود ریگز که قەشەی شاری سانتیاگۆ پایتەختی وڵاتی شیلی بو کتێبێکی بڵاو کردەوە کە ناوەکەی (نهێنی ماسۆنیەت دوای پەردە لەسەر هەڵماڵینی)بو تیایدا باس له چۆنیەتی دروست بونی نورانیەکان ئەکات و دەڵێت که کۆمەڵەیه[١٩]کی نهێنیی له ناو دڵی کۆمەڵەیەکی دیکەی نهێنی گەورەتر که ماسۆنیەته، هەر لەو کتێبەی دا ژمارەیەکی زۆر بەڵگە نامه دەخاتە ڕو که بەڵگەن بۆ ئەوەی سەرکردەکانی ماسۆن ئەوانەی که خاوەن پلەکانی (٣٢ و ٣٣) ن نازانن چی له کۆڕەکانی ڕۆژهەلاتی گەورە[٢٠] ئەو کۆڕانەی که بایك دروستی کرد ئەگوزەرێ . واتە کۆڕی ڕێوڕەسمی بالادی تایبەت که تیایدا مەشق بەو ئافرەتانه ئەکرێت لەوانە که دەبنە ئەندام له پیلان گێڕی جیهانی و تیایدا نهێنیان پیْ دەوترێت.

کاردینالْ له پەڕەی ١٠٨ له کتێبەکەی (بەڵگە نامەی یەکلاکەرەوە) ڕونی ئەکاتەوە (لومیی) کەلە لایەن جەنەڕالْ بایکەوە هەڵبژێردرا تا جێگەی مازینی بگرێتەوە له بەڕێوەبردنی جولانەوەی شۆڕشی جیهانی، حاخامێکی جولەکه بوە بەر لەوەی که بایك هەڵی نێت، ئەمەش ئەو پلانه بو که بوە هۆی گومڕاکردنی لێکۆڵەر و مێژونوسەکان لەبەر ئەوەی قەشه بالا دەستەکانی پیلانگێڕی ڕێوڕەسمی پەرستنی ئەهریمەنی هێنابوە ناو ماسۆنیەتەوە کە سەر بە کۆڕی ڕۆژهەلاتی گەورە و سەر بە ئەنجومەنی ڕێوڕەسمی بالادی بو. دواتر کەسانی دەگمەن هەلْ ئەبژێرن و نهێنی تەواووەتی وەر ئەگرن، ئەو نهێنییەی که له سەری پیلانگێڕییەکان دروست ئەکرێت و ئەوانیش بە نۆبەی خۆیان ئەبنە قەشە سەرەکییەکانی.

ئێمە زۆر جار گوێمان له باس کردنی ڕوداوەکانی ئەم سەردەمەمان ئەبێت بەو پێیەی که پەیوەندییەکانی ململانێیە له پێناو زالْ بون بەسەر بیری

---

([١٩]) ڕیزبەندی پلەی ماسۆنیەکان بە پێی دێرینی و قولْ بونەوە له نهێنیەکانی ماسۆنیەت و دواجار پله له کۆڕەکاندا. هەردو پلەی ٣٢ و ٣٣ بە ترۆپکی پلەکانی ماسۆن دادەنرێت.
([٢٠]) کۆڕی ماسۆنی سەرەکییه له تەواوی وڵاتەکانی جیهان.

مرۆڤایەتی بەڵام ئەو وتەیە تەنها بریتیە لە نیوەی ڕاستی لەبەر ئەوەی ئەو ئامانجانەی کە پیلانگێڕی وایزهاویت ئەیەوێت پێی بگات بریتیە لە:

١. نەهێشتنی تەواوی حکومەتە نیشتیمانی و ڕێکخراوەکان.

٢. نەهێشتنی بۆماوەیی.

٣. نەهێشتنی موڵکداری تایبەت بە شێوەیەکی ڕەها.

٤. نەهێشتنی هەستی نەتەوەیی و نیشتیمانی.

٥. نەهێشتنی ژیانی خێزانی و پیرۆزەی ژیانی خێزانی بەو پێیەی کە ژیانی خێزانی ئەو شانەیەیە کە شارستانیەت لەسەری دروست ئەکرێت هەروەك چۆن لە تەواوی شارستانیەتەکاندا ڕوی داوە.

٦. ڕەت کردنەوەی تەواوی ئاین و دامەزراوەکان لەسەر گۆی زەوی وەك سەرەتایەك بۆ جێگرتنەوەی لە لایەن نورانیەکانەوە، ئەو پیرۆزە ئەهریمەنییەی کە ئەیەوێت بە زۆر جێگەی ئاینەکانی دیکە بگرێتەوە.

نێوەندی سەرکردایەتی پیلانگێڕییەکە:

تاکۆتایی سەدەی هەژدەهەم نێوەندی سەرکردایەتی پیلان گێڕییەکە شاری فرانکفۆرت بو لە ئەڵمانیا کە تیایدا خێزانی ڕۆتشیڵد دروست بو و لە ژێر دەسەڵاتیدا ژمارەیەك لە گەورە سەرمایەدارە جیهانیەکانی گرتە خۆ لەوانەی کە ویژدانیان بە ئەهریمەن فرۆشتبو.بەڵام سەرۆکایەتی پیلانگێڕییەکە گواسترایەوە بۆ سویسرا دوای ئەوەی کە حکومەتی باڤاریا لە ساڵی ١٧٨٦ ئابڕوی بردن و لە دەری کردن، ئەوانیش تا کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم لەوی مانەوە و دواتر چونە نیویۆرك و نێوەندی سەرۆکایەتیەکەیان بوە باڵەخانەی هارولد برات.

لە نیویۆرکیش بنەماڵەی ڕۆکفلەر جێگەی بنەماڵەی ڕۆتشیڵدی گرتەوە لەگرتنە دەستی باج و ئاڕاستەکردنی دوای سەرکەوتنی پیلانگێڕییەکە...

دوای ئەوەی کە پیلانگێڕییەکە سەرکەوتن بەدەست ئەهێنێت لە دوا قۆناغدا، حکومەتی جیهان دروست ئەبێت و سەرۆکی ڕەهای ئەبێت بە سەرۆکی کڵێسای جولەکە. حکومەتەکەش لە کڵێسای جولەکە و ژمارەیەك زانا و سەرمایەدارەکان پێك دێت لەوانەی کە ڕاستگۆیی خۆیان سەلماندوە بۆ بیروبۆچونی ئەهریمەنانە. مرۆڤایەتیش ملکەچی ئەم حکومەتە ئەبێت و گەشە ئەکات بە پێی یاساکانی پیتاندنی دەستکرد (کارەکانی لەسەر ئاستی جیهان ڕێك ئەخرێت).

برتراند ڕاسل کە فەیلەسوفێکی جیهانییە لە پەڕەکانی ٤٩-٥١ ی کتێبەکەی کە بە ناونیشانی(کاریگەری ئاشتی لەسەر کۆمەڵگا)یە ئەڵێت کە مۆرڤ لە جیهانی داهاتودا بە شێوەیەك ڕێك ئەخرێت کە تەنها ٣٠٪ لە مێیینە و ٥٪ لە نێرینەکان بەشداریئەکەن لە دروست کردنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی و لە داهاتودا هەمەچەشنی و ژمارەکەی بە پێی خواستی دەوڵەت دیاری ئەبێت[٢١].

ئەم باسە بە هەڵبژاردەیەك کۆتایی پێ ئەهێنم لە وتاردانی سەرکردەکانی ئەنجومەنە ماسۆنیەکان - بالادیەکان- کە لە لایەن جەنەڕاڵ بایکەوە دروست کرابو لە ئەندامانی کۆڕی ڕۆژهەلاتی گەورە لە پاریس: لە سەرەتای ئەم سەدەیەماندا جێبەجێکردی یاساکانی جوییم - ئەوانەی کە جولەکە نین -هاتە خوارەوە کەلە بەر کاریگەری ئێمە هاتە نزمترین ئاستی، ئێمە ئەتوانین لە بەهای ئەم یاسایانە کەم بکەینەوە لە ڕێگەی شیکارکردن و باس لێکردنی بە شێوەیەك کە دوری خاتەوە لە مانا ڕاستەقینەکەی. ئێمە ئەم ڕێگەیەمان خستۆتە ناو بازنە یاساییەکانیەوە و ئێستاکە دادوەرەکان بۆخۆیان بڕیار لەسەر پرسەکان ئەدەن وەك ئەوەی کە پێیان دەوترێت. واتە بڕیار دەر ئەکەن بە پێی ئەو یاسایانەی کە ئێمە پێشنیاری ئەکەین تا بە پێی ئەوە جوییم پیادە بکەن، ئەمەش بێ گومان لە ڕێگەی کەسانێکەوە ئەکرێت کە گەمەن بە دەستی

---

(٢١) دروست کردنی منداڵ بە شێوەی دست کرد لەناو تاقیگەکاندا بەشێوەیەکی بەربڵاو لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا بڵاو بۆتەوە لەو ڕووەوە ڕیکلامی زۆر ئەکرێت و بۆتە جێگەی بایەخی نێوەندە زانستی و کۆمەڵایەتی و ئاینیەکان.

خۆمانەوە سەرباری ئەوە کە هیچ پەیوەندییەکی دیار و ئاشکرا نییە لە نێوانماندا. تەنانەت ئەندامانی ئەنجومەنی پەرلەمانیش هەیە کە کار بە پارێزی ئێمە ئەکەن.

ڕەنگە ئەمەی کە باسی لێوە کرا بەس بێت - بۆ ڕای ئەمەریکی - بۆ ڕونکردنەوەی نهێنی ڕوداوەکانی ڕەگەز پەرستی لە شارۆچکەی لیتل ڕۆك کە دوای نیو سەدە لەو وتارە ڕودەدات واتە سالی ١٩٥٧[٢٢].

ئایا هیچ بیریارێك ئەتوانێت ئەوە ڕەت بکاتەوە کە قۆناغە یەك لەدوا یەکەکانی پیلانەکەی وایزهاویت دوبارە جێبەجێ کرا؟ هەروەك چۆن جەنەراڵ بایك پلانی بۆ دانابو؟ ئایا ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا و ئەڵمانیا نەڕوخا؟ ئایا بەریتانیا و فەرەنسا نەبونە وڵات گەلێکی پلە سێ؟ ئایا سەرکردە تاج لەسەرەکان لە جیهاندا وەك میوەی گەییو یەك لەدوای یەك نەکەوتنە خوارەوە؟ بەڵێ و جگەلەوەش جیهان دابەش بو بەسەر دو سەربازگەی دژ بەیەك لەدەرەنجامی پڕپاگەندەی نورانیەکان، ئاگری دوجەنگی جیهانی هەڵگیرسا و بوە هۆی ڕشتنی خوێنی دەیان ملیۆن کەس لە مەسیحییە ڕۆژئاواییەکان بە بێ ئەوە هیچ لایەك لە بەشداربوانی ئەو شەڕە هۆکارێکی سەرەکی هەبێت لەدژی ئەوی دی... دو شۆڕشیش لەو سێ شۆڕشەی کە پلانی بۆ دانرابو ڕویان دا ئەوانیش شۆڕشی ڕوسیا و چین. کۆمۆنیزمیش پەرە پێدراو بەهێزکرا تا بو بە هاوکێشەیەك لە هێزی تێکڕای جیهانی مەسیحی ڕۆژئاوا... بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دور ئێستا زایۆنیزم نەخشەی پیلانگێڕی جێبەجێ ئەکات کە مەبەست لێی ئامادە کارییە بۆ جەنگی جیهانی سێهەمە لەو ناوچەیەدا، وەئەگەر ئێستا ئەو کارەساتە کۆمەڵایەتییە ڕانەگیرێت لە ڕێگەی جوڵاندنی ڕای گشتییەوە بە ڕاگەیاندن تا گوشارێکە بەهێز دروست بکرێت بۆ وەستاندنی

---

([٢٢]) لە سالی ١٩٥٧ بەهۆی ڕەگەپەرستییەوە پێکدا کێشانی گەورە ڕوی دا لە شارۆچکەی ناوبراو بوە هۆی دەست وەردانی سوپای ئەمەریکا لەدژی دەسەڵاتی ئەو ویلایەتە. ئەم ڕوداوە بوە هۆی لەکەدار کردنی ناوبانگی ئەمەریکا و یاساکاندی دژی ڕەگەز پەرستی و دادگاکانی ئابڕوبرد لەبەر چاوی جیهان و نارخۆدا.

پیلانگێرییەکانی زایۆنیزم، لەبەر ئەوەی کارەساتی جیهانی بەڕێوەیە و دوای ئەوەش جەستە و هۆش و بیری مرۆڤایەتی دەکرێتە کۆیلە.

ئایا کەس ئەتوانێت ئەو ڕەت بکاتەوە کە کۆمۆنیزم ئێستا ئازاد کراوە لەو وڵاتانەی کە پێی دەوترێت جیهانی ئازاد لە کاتێکدا کەپیاوانی دەزگا هەواڵگرییەکان لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو بەڕیتانیا و کەنەدا ئەتوانن لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا تەواوی سەرکردەکانی جیهان دەستگیر بکەن. بەڵام ئەو بڕیارانە هیچ کات دەرناچێت؟ بۆچی؟ وەڵامەکە زۆر سادەیە.. (لەبەر دەرفەت ڕەخساندن بۆ کۆمۆنیزم تا خۆی بکونجێنێت لە سەر تەواوی ئاستەکانی ناوەوە و دەرەوەی ئەو وڵاتانە و ئەمەش بە ڕێنوێنی سەرچاوەی نورانیەکان ئەکرێت ئەوانەی کە یاساو ئەهێننەوە بۆ ئەو جۆرە سیاسیەتە کەئێستا پیادە ئەکێت لەلایەن وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و کەندا و بەڕیتانیا لە جیهاندا بەرامبەر بە کۆمۆنیزمی جیهانی و ناوخۆ). ئەگەر پیاوانی هەواڵگری ئێستا کاربکەن لەسەر گرتنی سەرکردەکانی کۆمۆنیزم، دادوەرانی دادگاکانی باڵای ئەو وڵاتانە بەناو دەقە یاساییەکاندا ئەچنەوە تا یاسایەك بدۆزنەوە و بۆ ئازاد کردنیان. بێ گومان پلانێکی لەم چەشنەش ئامانج لێی تەنها دەرفەت ڕەخساندنە بۆ ئەو کۆمۆنیزمەی کە بەردەوام خۆی ئەگونجێنێت تا دواجار بەکار بهێنرێت لە بواری دروست کردنی کارەساتی کۆتایی مرۆڤایەتی.

ئایا ئێستا کاتی ئەوە نەهاتوە کە جیهانی مەسیحی بەئاگا بێتەوە لەو مەترسییەی کە ڕوی تێکردووە؟ ئایا ئێستا کاتی ئەوە نەهاتوە کە باوکەکان ڕێگری بکەن لە منداڵەکانیان تا ڕۆژێك لە ڕۆژان نەبنە تەقەمەنی تۆپەکانی زاییۆنیزم و بنەما ئەهریمەنییەکان. ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە بۆ ئێمە لە ڕۆژئاوا تا دواجار ببین بە دروست کەرانی ئەو جیهانەی کە ڕاستی خواوەند تیایدا باڵادەستە لەبری ئەوەی کە تەنها وەك گوێگری قسەی خواوەند و پیلانگێڕی جیهانی بمێنینەوە ؟

یەکێتی پیاوە مەسحییە بە ئاگاکان کە من شەرەفی ئەوەم هەیە سەرۆکایەتی بکەم هەر زانیارییەك کە توانیویەتی بە دەستی بهێنێت لەسەر لایەنە

جیوازەکانی ئەو پیلانگێرییە خستویەتییە بەردست جەماوەر،ئەو زانیارییانەشمان لە دوتوێی دو کتێبدا بڵاو کردۆتەوە کە بریتین لە (بەردگەلێک لەسەر تەختەی شەترەنج) و (تەمێکی سور بەسەر ئەمەریکاوەیە) سەرباری نوسراوگەلێکی دیکە.

ئەم دو کتێبە بەسن بۆ هەر کەسێك کە توانیبێتی بیان خوێنێتەوە تا لە پیلان گێڕییەکان تێ بگات تا ئەو جێگەیەی کە ئێمە ئەزانین، ئێمەش بە نۆبەی خۆمان بەردەوام ئەبین لە سەر ئاگادار کردنەوەی خوێنەران لە هەر هەواڵێکی نوێ لەو بارەوە لە ڕێگەی بڵاو کردنەوەی هەفتەنامەیەك لە ژێر ناونیشانی (هەواڵ لەوای هەواڵ).بەڵێنی ئەوەش دەدەین کە ئەو هەواڵانەی کە پەیوەندی بە پیلان گێڕییەکانەوە هەیە دەم و دەست بڵاویان بکەینەوە بە پێی زانیارییمان لە سەر ئەو پیلانگێڕییە بەردەوامە و ئەزمونمان لەو بارەوە، ئەو ڕوداوانەش بە ئەندازەیەك ڕویان داوە کە وای لێ کردین زۆرترین بیریار ئاگادار بکەینەوە لەو بارەوە لە جیهاندا... لێرەوە داوات لێ ئەکەین کە تۆش پەیوەست بیت بە ئێمەوە لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە کردن لە قۆناغ و سیما جیاوازەکانی ئەو پیلان گێڕییە و دواتر خستنە ڕوی زانیارییەکانت بۆ هەموان لەبەر ئەوەی کاتێك کە ئەو کارە ئەکەین ڕایەکی جیهانی دروست ئەکەین کە تا دێت بەهێز تر ئەبێت تا وای لێ دێت کە سەرکەوێت بەسەر هەر هێزێکی مادی لەسەر زەوی.

# بانگەوازێک بۆ گەلی ئەمەریکا

ئێمە لە ئەمەریکا داوات لێ ئەکەین کە کۆمەڵەی مەدەنی مەسیحی یاخود هەر هاو شێوەیەکی ڕێك بخەیت بۆ لێکۆڵینەوە و ئاگادارکردنەوە و گرد بونەوە تا تەنها هاوڵاتیە دڵسۆزەکان بۆ پۆستە گشتیەکان و ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێردرێن. بەڵام پێویستە لەسەرت بەر لەوە کاندیدێك بۆ پۆستێکی گرنگ هەڵبژێریت، کە بزانێتئەو کەسە بە تەواوەتی بەئاگایە لە پیلانگێڕییە جیهانییەکە و سیماکانی بە پێی تەواوی ئاستەکانی شارۆچکەو و ویلایەت و وڵات... لەبەر ئەوەی ئەوانەی کە باوەڕیان بە دروست کردنی جیهانێکی یەکتا هەیە گەر بزانن چی ئەکەن تێکڕایان ڕازی نین کە خزمەتی کڵێسای جولەکە بکەن... لەبەر ئەوە لەسەرمانە وەك ئەمەریکییەك کە لە ڕاستی ئاگاداریان بکەینەوە. هەروەها پێویستە کە فراکسیۆنە مەسیحیەکان خۆیان بەدور بگرن لەوەی کە سەر بە لایەنێکی دیاری کراو بن. لەبەر ئەوەی تەنها ئامانجمان ئەبێت ئەوە بێت کە باوەڕ بە خواوەند بگێڕینەوە و ڕاستی بگێڕینەوە بۆ شوێنی خۆی لە جیهانی سیاسەت دا تا ئەمەریکا دواجار بتوانێت کە حکومەتێك دابمەزرێنێت پەیرەوی لە ڕێگەی خواوەند بکات هەروەك ئەوەی کە مەسیح مزگێنی ئەدات.

ئەمە ئەو بنەمایانەیە کە پێویستە لەسەری بوەستین تا بە بۆچونی من بتوانین نزاکانمان بهێنینە دی بە دروست کردنی جیهانێکی باشتر کە تەنها خواوەند و ڕاستی تیایدا باڵا دەست بێت.

واژۆ

ولیام گای کار

کۆلۆڕادۆ – وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا

## بەشی یەکەم

# جوڵانەوەی شۆڕشی جیهانی

### ڕەوتی فەلسەفەیەکی ئاینی

ئەگەر بمانەوێت لەو هۆکارانە بگەین کەلە ڕابوردودا لە دایك بوە و ئەو دەرەنجامەی دروست کردوە کە ئەمڕۆکە ئێمە تیایدا دەژین بە تایبەت ئەوەی کە پەیوەستە بە دۆخی خراپی نارخۆی وڵاتان، هەر بۆیە پێویستە کە مێژوو بخوێنین لەبەر ئەوەی مێژووهەمیشە خۆی دوبارە ئەکاتەوە.

مێژوو هەمیشە خۆی دوبارە ئەکاتەوە لە بەر ئەوەی ئامانجی ململانێ لەدێر زەمانەوە هەر هەمان ململانێیە، مەبەست ململانێی دێرینی نێوان هێزەکانی خێر و هێزەکانی خراپەیە کە ئەویش بە نۆبەی خۆی دابەش بوە بەسەر چەن لایەنێکداکە ئامانجی هەر یەکەیان گەیشتنە بە ئامانجی ئەو کۆمەڵەیەی کە لەناویدا هەوڵ ئەدات ئەمەش لێکۆڵینەوەکەمان شتێك ئاڵۆزتر ئەکات.

ئەم جیاوازیانە لە بۆچونی ئەم لایەنانەدا لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئەگاتە جەماوەر، بەڵام بەگشتی لەم دەزگایانەدا درۆ بەکار دێت، یاخود نیوەی ڕاستی لە جەماوەر ئەگەیەنرێت لەبری ئەوەی تەواوی ڕاستیەکە بگوازرێتەوە بۆ جەماوەر.

بازرگانەکانی جەنگ ڕاگەیاندن بە شێوەیەکی ڕێکخراو بەکار ئەهێنن بۆ دابەش کردنی مرۆڤایەتی بەسەر دو سەربازگەی دژ بەیەك لەبەر هۆکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و ئاینی بە شێوەیەك کە هەمیشە توانیویانە

که هەردو سەربازگەکە بجوڵێنن تا بگەنە ئاستێك لە دژایەتی کە پەلاماری یەکتر بدەن و یەکدی لەناو بەرن. کەواتە پێویستە لەسەرمان ئەو هۆکارانە بزانین کە بونەتە هۆی دروست کردنی ئەو دەرەنجامانەی ئەمڕۆ، پێویستە زۆر بەوردی لە تەواوی دیاردە ناڕاستەکان بکۆڵینەوە و لە ڕوداوەکانی ڕابوردوش بکۆڵینەوە تا لەوە بگەین کە چۆن ئەو ڕوداوانە کاریان لە ژیانی ئەمڕۆمان کردوە و ئەو کاریگەرییانەش چین.

لە ڕوی ئاینیەوە جیهانی ئەمڕۆ دابەش بوە بەسەر دو سەربازگەی سەرەکی، ئەوانەی کەسەر بە سەربازگەی یەکەمن باوەڕیان بە بونی خوا هەیە - ئەگەرچی ڕێگەی باوەڕ هێنانەکەشیان جیاواز بێت - ئەوانەش کە سەر بە سەربازگەی دووەمن بونی خوا یاخود هەر هێزێکی دیکەی لەو چەشنە ڕەت ئەکەنەوە. ئەم دابەش بونەی بایەخێکی زۆری هەیە و ئێمەش ئەیسەلمێنین کە جەنگ و شۆڕشەکانی ڕابوردو لە دەرەنجامی هەوڵی سەربازگەیەکەوە بوە بۆ سەپاندنی بیروبۆچونی بەسەر تەواوی گەلانی جیهاندا ئەمەش بەهۆی ململانێی نێوان دو سەربازگەکەوە بوە.

ئەو بیرکردنەوەیەی کە باوەڕی بە بونی خواوەند هەیە پەل ئەهاوێت بۆ چەند ئاینێك، ئەو ئاینانە کە باوەڕیان بە خوای یەکتا هەیە باوەڕیان بە خوایەکی بێ هاوتا هەیە کە ئەم گەردونەی دروست کردوە. بەڵام ئەوانەی کە باوەڕیان بە فرە خوایی هەیە پێیان وایە کە خواو و گەردون یەکن - واتە باوەڕیان بەوە هەیە کە ڕۆحی خوا لە ناو سروشت و گەردوندا بونی هەیە - ئەو ئاینانەش کە باوەڕی بەم بۆچونە هەیە بریتین لە ئاینی بوزی و هندۆسی.

ئەوەی باوەڕی بە خوایەکی یەکتا هەبێت، ئەبێت باوەڕی بە ژیانی دوای مردنیش هەبێت، لەبەر ئەوەی مردن تەنها بۆ جەستەیە. هەروەها ئەم بۆچونە باوەڕی بەوە هەیەکە ئەهریمەن دروست کەری خراپەیە، بەراوردی ئاینی هۆزە دورەپەرێزەکانی ئوستڕالیا و ئەفەریقاش دەری دەخات کە شتێکی خۆڕسك پاڵی پێوە ناون تا بەدوای وەڵامی پرسیار گەلێك دا بچن وەك: بۆچی لەدایك بوین؟ بۆچی ئێمە ئەژین؟ هۆی بونمان لەم ژیانەدا چییە؟ دوای مردن بۆکوێ

ئەچین؟ بەم شێوەیە دواکەوتو ترین هۆزەکان توانیویانە بۆچونیان هەبێت لەمەڕ بونی خواو و ژیانی دوای مردن، لێکۆڵینەوەی بەراوردی ئاینەکانیش پێمان دەڵێت کە تەواوی ئاینەکان باوەڕیان بە بونی سیستەمێکی سەروتر هەیە کە دەست پێ دەکات لە لۆژیکێك کە ئەویش بانگەواز کردنە بۆ پەیام گەلێکی بەرز کە دەکرێت بڵێین یەکێکە لەگەڵ پەرستنی خوادا، ڕێزگرتن لە باوك و دایك و کەسانی بەتەمەن و خۆشویستنی ئەوانی دی و نوێژکردن و نزا کردن بۆ دۆست و هاوڕێکان بونی هەیە، دواتر مرۆڤ بە چاوچنۆکی و حەزەکانیەوە هات تا بە زۆر دەست بگرێت بەسەر مرۆڤ دا و بەمەش ئاینیان لە ئاستی بەرزەوە هێنایە سەر ئاستێکی زۆر نزم.

لە نێوان ئاینەکانیشدا کە لە ئاستێکی بەرزەوە هێنرایە سەر ئاستێکی نزم ئاینی مەسیحیەتە[٢٣] کە تا ئاستێك ئاینێکی نوێیە، لە هەمان کاتدا ئەم ئاینە بەشی زۆر لێبۆتەوە کە بە ئەستەم ئەتوانرێت پەیوەندی لە نێوانیاندا بدۆزرێتەوە و ئەو ڕۆحە دەستە جەمعییەی لەدەست داوە کە پێشتر بە یەکێك لە بنەماکانی دادەنرا و گەیشتۆتە ئاستێك کە ئیدی نزاکان بێ مانا بێت بەبێ ئەوەی بنەما سەرەکییەکانی پیادەبکرێت. ڕونە کە لاوازی ئایین و لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوە بە واتای بە هێز بون و بڵاو بونەوەی ڕەوتی بێ باوەڕی دێت.

بە پێی ئەو هۆکارانەی کە باسمان لێوەکرد دەردەکەوێت کە بنەما جێگیرەکانی ئاینی مەسیحی تا دێت هێزی نامێنێت بەسەر گەنجانی ئەو گەلانەی کە بەخۆی دەڵێت ئەوە ئازادەکان[٢٤]. ئەوەش کە بە شێوەیەکی گشتی ڕو دەدات ئەوەیە کە ئەو گەنجانەی کە باوەڕیی ڕۆحیان لاوازە باوەڕ بە یەکێك

---

(٢٣) واتە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بە شێوەیەکی گشتی. لێرەدا نوسەر ئەو ناو لێنانە ئەخاتە ڕو کە ڕۆژئاوا لە خۆی دەنێت واتە (جیهانی ئازاد).

(٢٤) زۆرێك لە جولەکەکان بە تایبەت لە قەشە توند ڕەوەکانیان پێیان وایە کە تێکڕای ئەو شتانەی کە جوییم هەیەتی لە ڕاستی دا موڵکی گەلی هەڵبژاردەی خوایە واتە جولەکەکان کە تەنها ئەوان مافی خاوەندارێتییان هەیە.

له بۆچونه بێ باوەڕەکان ئەهێنێن واتە بیری نازی یاخود بیری کۆمۆنیزم یاخود له نێوانیاندا سەرگەران ئەبێت.

"پێویسته لەسەرمان لێرەدا که ئاماژه بەین بەوەی که مەبەستمان له نازی به شێوەیەکی گشتی پارتە ڕاستڕەو و توند ڕەوکانه که له ڕوی بیرەوه سەر به ئارییه دیکتاتۆرەکانن که فاشیزم و نازیزمی هیتلەرییان بەکار هێنا بۆ گەیشتن به ئامانجه نهێنیەکانیان. ئەوانیش به هەمان شێوەی خاوەن بانکه گەورەکان ڕێکخراوێکی جیهانی بەکار ئەهێنن بۆ گەیشتن به پلانه نهێنیەکانیان بۆ دەست گرتن بەسەر جیهاندا.

بەردەوام بونی دۆخی جیهان بەم شێوەیەی که هەیه تەنها ڕێگه خۆشکەره بۆ سەرکردەی یەکێك لەو دو لایەنه تا زاڵ بێت بەسەر جیهاندا و دواتر چەوساندنەوەی هەر یەکێك که باوەڕ به بۆچونەکەیان بهێنێت له ڕوی جەستەیی و ڕۆحی و فکرییەوه، لەم حاڵەتەدا ئەوه نورانیەکانن که دەسەلاتە دۆزەخییەکەی خۆیان ئەسەپێنن بەسەر هەمو جیهاندا[٢٥].

ئەگەڕێینەوه بۆ دو سەربازگه ئاینیەکه، ئەبینین ئەوانەی که باوەڕیان به بونی خوایەك هەیه ڕوی تێدەکەن و دەیپەرستن و پێك دێن لەسەر تیۆری گەلێکی هاوبەش لەسەر بنەچەی مرۆڤ (ئادەم وحەوا) و دواتر کۆکن لەسەر تیۆرەکەی ئاینی دیکه که دەڵێت خواوەند ئەم جیهانەی به مرۆڤ ئاوەدان کردۆتەوه و ویستێکی ئازادیشی بەخشیوه به هەر کەسێك و بەمەش دەرفەتێکی نوێی پێ بەخشیوه تا به پێی خواستی خۆی هەڵبژێرێت لەسەر زەوی که پەیڕەوی له خوا بکات یاخود له ئەهریمەن، لێرەدا پێویسته ئاماژه بەوه بکەین که ئەو ناوی که کتێبه پیرۆزەکان له ئەهریمەنی دەنێن (لوسیفەر)ه که بەلاتینی ماناکەی دەبێته هەڵگری ڕوناکی[٢٦]. تەنها بێ باوەڕەکان و ئەوانەش که باوەڕیان به بۆچونەکانی داروین هەیه باوەڕیان به تیۆرەی بنەچەی مرۆڤ نییه.

---

(٢٥) مەبەستی نوسەر له نورانیەکان جەمسەرەکانی پیلانگێڕی جیهانیه.

(٢٦) لێرەدا نوسەر مەبەستی نورانیەکانه.

بەردەوام بونی ژیان لەسەر گۆی زەوی خوازیاری زاوزێ کردنە ئەمەش وا لە ئەوەکانی ئێستا ئەکات کە بێ ئاگا بن لە بنەچەی ژیانی مرۆڤایەتی، ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە تەنها ڕاستیەك ئێمە دەیزانین ئەوەیە کە هەر مرۆڤێك ویستێکی ئازادی پێ بەخشراوە تا هەڵبژێرێت لە نێوان باوەڕی ئاسمانی یاخود باوەڕی مادی گەرایی بەهەردو بەشەکەی واتە: ئازی کە باوەڕی بە ڕەگەز پەرەستی هەیە لەگەڵ کۆمۆنیزم کە تیایدا تەنها باوەڕ بە پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەت هەیە.

لێرەدا پێویستە جیاوازی نێوان نازیزم و فاشیزم یادی خوێنەر بهێنینەوە کە جولانەوەی فاشیزم لە ساڵی ١٩١٩ لە ئیتاڵیا دەستی پێکرد وەهەر لە سەرەتاوە – بە پێچەوانەی هەندێك پروپاگەندە – جولانەوەیەکی ئاینی بو، دروست بو بۆ دژایەتی کردنی بێباوەڕی جهانی بیری مارکسیزم[٢٢] و لە لایەکی دیکەوە دروست بو بۆ پشتیوانی کردنی بیری نەتەوەیی لەدژی بیری نێو نەتەوەییبەپێی ئەوەی کە نازییەکان و خاوەن بانکە جهانی وپیشەسازی و هەندێك لە سیاسیەکان نەخشەیان بۆ کێشابو.

ئێستا دێینە سەر سەربازگەی دووەم کە سەربازگەی بێ باوەڕییە، ئەبینین کە زۆرینەی بێ باوەڕەکان لە سەر بنەمایەکی هاوبەش پێك دێن ئەویش ئەوەیە کە: تەنها ڕاستییەك هەیە کە ئەویش مادە یاخود ووزەیە و ئەو وزەیەش خۆی هێزەکانی پەرەپێداوە تا لە شێوەی ڕووەك و دواتر ئاژەڵ و مرۆڤ دەرکەوتوە، دەرەنجام ئەوان بە ڕۆح ئەزانن و درك بەوە ئەکەن کە ڕەنگە ژیانێکی دیکە هەیە دوای مردنی جەستە. ئەم سەربازگەیەش دابەش دەبێت بەسەر دو بەشدا کە ئەویش کۆمۆنیزم و نازیزمە.

---

(٢٢) جارێکی دیکە دوبارەی ئەکەینەوە کە مەبەست لە جیهانی ئەو باوەڕەیە کە ئامانجی دەست گرتنە بەسەر جیهاندا لە بەرژەوەندی لایەنێك نەوەك بنەمای برایەتی مرۆڤایەتی کە ڕەنگە خوێنەر بە هەڵە بەو شێوەیە تێی بگات.

# کۆمۆنیزم و نازیزم و کارڵ مارکس و کارڵ ڕیتەر

لەم کتێبەدا بەڵگە ئەهێنینەوە لەسەر ئەوەی کە دروست بونی کۆمۆنیزمی نویێ لەساڵی ١٧٧٣ دا بوە لەسەر دەستی کۆمەڵێك لە سەرمایەدارە جیهانیەکان و هەر لەو کاتەوە بەکار هێنراوە وە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان کە ئەویش دروست کردنی دەوڵەتێکی بێباوەڕە لەسەر بنەمای دیکاتۆریەتێکی هەمەلاین. لینینزۆر بەڕونی ئەم وتەیەی باس کردوە لە کتێبێکی بە ناو نیشانی (کۆمۆنیزم باڵی چەپ ڕەو)و لە پەڕەی ٨٣ی ئەو کتێبەدا ئەڵێت: "تیۆریەکەمان ئایین نیە بەڵکو ئامرازێکە بۆ ئیش کردن". ئەم وتەیەش لە لایەن زۆرێك لە سەرکردەکانی کۆمۆنیزم دوبارە کراوەتەوە، لە ڕاستیشدا جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لەنێوان بێ باوەڕی نازیەکانو بێ باوەڕی کۆمۆنیزمەکان، تەنها جیاوازی لە نێوانیاندا ئەو ڕەوشانەیە کە بەکاری دەهێنن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان کە ئەویش دەست گرتنە بەسەر جیهان و هێنانە دی بۆچونەکانیانە بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی ستەمکاری بێ باوەڕ لەسەر تاسەری جیهاندا. کارڵ مارکسیش کەلەنێوان ساڵەکانی ١٨١٨-١٨٨٣ ژیاوەئەڵمانییەکی بەڕەچەڵ جولەکە بوە کەلە ئەڵمانیا و دواتر فەڕەنسا دەرکراوە لەبەر بونی چالاکی شۆڕشگێڕی بۆیە دوجار پەنای بردۆتە بە ئینگلتەرا. لەساڵی ١٨٤٨ کتێبی مانیفێستی بڵاو کردەوە و تیایدا مارکس پلانە درێژ خایەنەکەی بڵاو کردەوە کەلە قڵپ کردنەوەی جیهاندا خۆی دەبینێتەوە (یەکگرتنی کۆمارە سۆسیالستە شوراییەکان) و پێشبینی ئەوەشی کردبو کە ئەو پیلانە ڕەنگە چەند سەدەیەك بخایەنێت.

بەڵام کارڵ ریتەر کە ئەویش ئەڵمانییە و لە نێوان ساڵەکانی ١٧٧٩-١٨٥٩ ژیانی بردۆتە سەر، مامۆستای مێژوو و زانستە جیۆستراتیجیەکان بوە. ئەم تیۆرییەکی پێچەوانەی مانیفێستی کۆمۆنیستی پێبوە و نەخشەیەکی داناوە کە لە ڕێگەیەوە ڕەگەزی ئاری ئەتوانێت دەست بگرێت بەسەر ئەورووپا و دواتر تەواوی جیهان.

هەندێکیش لە سەرکردە ئارییەکان ئەو پلانەی ڕیتەریان گرتە خۆ و نازیزمیان دامەزراند بە ئامانجی هێنانە دی ئامانجی دەست گرتن بەسەر جیهان و گۆڕینی بۆ دەوڵەتێکی بێ باوەڕ کە مل کەچی ستەمکارییەکی سەرتاسەری بێت.

بۆ ئەوە کۆمەڵە ئارییەکان دەرکەوتنتا لە نێوان هاوپەیمانی کردن لەگەڵ خاوەن بانکە جیهانیەکان[٢٨] یاخود تێك شکاندنی هێز و دەسەلاتیان یەکێکیان هەڵبژێرێت.

ئێمە پێمان وایە کە ژمارەیەك لەوانەی کە لەگەڵ نازیزم و کۆمۆنیزمدا کار ئەکەن ئەزانن کە ڕێکخراوەکانیان لە ژێر دەسەلاتی نورانی و جولەکە دەست ڕۆشتوەکانی ناو کلێسا دان و پێشمان وایە کە ئەو ژمارەیە لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکات.

سەرکردەی ئەو دو ڕێکخراوە بێ باوەڕە واتە کۆمۆنیزم و نازیزم پێك دێن لەسەر ئەوەی کە دەوڵەت و سەرکردە بخەنە جێگەی خواوەند و بیکەنە خواوەندی سەر زەوی.

ڕەنگە ئەوەی کە جەماوەر لە بارەی کارڵ مارکس و کۆمۆنیزم ئەیزانێت زۆر لەوە زیادتر بێت کە لە بارەی کارل ڕیتەر و نازیزمەوە ئەیزانێت، کارڵ ڕیتەر بۆ ماوەی چەند ساڵێك مامۆستای مێژوو بو لە زانکۆی فرانکفۆرت لە ئەڵمانیا و دواتر بوە مامۆستای جوگرافیا لە زانکۆی بەرلین، لە نێوەندەکانی خوێندن و فێرکردندا بە یەکێك لە کەسە دیارەکانی بواری مێژوو و جوگرافیا و زانستی

---

(٢٨) کاتێك کە باس لە خاوەن بانکە جیهانیەکان ئەکات، بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ مەبەستی لە نورانیەکانە.

جیۆسیاسی دادەنرا. هۆکاری نەبونی زانیاری لەسەر پەیوەندی نێوان کارڵ ڕیتەر و سەرکردە نازیەکان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەمیشە هەوڵ دراوە کە سەرکردەکان ئامانجەکانیان بە شاراوەیی بهێڵنەوە.

هەندێك لە ئەفسەرە هەواڵگرەکانی بەریتانیا توانیان کە پەردە لەسەر پەیوەندی نێوان ڕیتەر و سەرکردە ئەڵمانیەکان لابدەن کاتێك کە ئەرکی لێکۆڵینەوە کردن لەسەر ئابوری سیاسی و زانستی جیۆسیاسی و ئاینە لێك نزیکەکانیان پێ سپێردا. ئەوانیش ئەو زانیارییانەی کە بەدەستیان هێنابو گەیاندیانە دەسەڵاتە پەیوەندی دارەکان.

بەڵام ئەوەی ڕوی دا ئەوە بو کە سەرکردە سیاسی و دیبلۆماسیەکان بایەخی ئەو زانیارییانەیان نەزانی و وایان پێ باش بو کە فەراموشی بکەن.

کارڵ ڕیتەر دوای ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ژمارەیەك لە گەورە خاوەن داراییە جیهانیەکان کە هیچ جۆرە وابەستەییەکیان نیە بە هیچ جۆرە وڵاتێك دەستوەرئەدەن کاروباری تەواوی وڵاتەکان، لە ساڵی ١٧٧٣ مسۆنیەتیان دروست کردوە کە سەر بە کوڕەکانی خۆرهەڵاتی گەورەیە بە ئامانجی بەکار هێنانی شۆڕشی جیهانی لە پێناو ئامانجە نهێنیەکانیان بە مەبەستی دەست گرتن بەسەر سامانە سروشتی و مرۆییەکانی تەواوی جیهان و دروست کردنی حکومەتێکی ستەمکاری سەرتاپاگیر لەسەر بنەمای مەتریالیزمی بێ باوەڕی.

ڕیتەر لە یادەوەرییەکانی دا دەڵێت کە زۆربەی ئەو خاوەن داراییانە گەر هەمویان جولەکە نەبن، لانی کەم ڕێوڕەسمی ئەوان بەکار ئەهێنن.

ڕیتەر لەوەڵامی ڕەت کردنەوەی مانیفێستی کۆمۆنیستی کارڵ مارکس باس لەو مەترسیانە ئەکات بۆ سەر جیهان لە کاتێك ئەگەر ڕێگە بدرێت بەو کەسانە کە بەردەوام بن لەسەر دەسەڵاتی سیاسی کۆمۆنیزمی جیهانی و ئاراستە کرنی بە پێی پلانەکانی خۆیان. دواجار چەند پێشنیارێك ئەخاتە بەردەم سەرکردە سەربازیەکانی ئەڵمان بۆ ڕوبەڕوبونەوەی پیلانگێڕ خاوەن دارییە جولەکەکانبە ئامانجی دەست گرتنی ڕەگەزی ئاری بەسەر سەرچاوە سروشتییەکانی جیهان.

ریتەر لە نەخشەکەیدا ئاماژە ئەدات بە سەرکردەکانی ڕەگەزی ئاری لە دامەزراندن و ڕێکخستنی نازیزم و بەکار هێنانی فاشیزم وەك ئامرازێك بۆ کار بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نهێنیەکان و داگیرکردنی جیهان.

ریتەر لە نەخشەکەیدا لایەنێکی دیکەش دەردەخات و دەڵێت کە سەرمایەدارەکان بە مەبەست و بە چەند ئاڕاستەیەك پرسی جولەکە بەکار ئەهێنن، هەر بۆیە لە سەر سەرکردەکانی ڕەگەزی ئاری پێویستە کە دژایەتی جولەکە بکات لە پێناو ڕەگەزەکەی خۆیدا.

پلانەکەی ڕیتەر ئەم پێشنیارانەی لای خوارەوە لە خۆ ئەگرێت:

١. مل کەچ پێکردنی تەواوی گەلانی ئەورووپا بۆ دەسەلاتی ئەڵمانیا، ئەمەش بەپێی پێشنیارەکەی ڕیتەر لە ڕێگەی (جۆنکەرز)ەکان کە چینێکن لە نەجیب زادە دەرەبەگەکانی ئەڵمانیا و دەست دەگرن بەسەر دەسەلات و دواتر بەشداری کردن لە زنجیرەیەك کاری سەربازی دژی ئەورووپا بە ئامانجی مل کەچ پێکردن و لاواز کردنی لە ڕوی مرۆیی و ئابورییەوە.ڕیتەر ئەڵێت کە مەرج نییە ئەو کارە سەربازییە بە سەرکەوتن کۆتای پێ بێت بەڵکو ئەوەندە بەسە کە ئەو وڵاتەی کە هێرشی دەکرێتە سەر هێندە لاواز ببێت کە کاتی زۆرتری لە ئەڵمانیا بوێت بۆ خۆ دروست کردنەوەی خۆی. هەروەها ڕیتەر ئاماژە ئەدات بە بایەخی زۆری ئەوەی کە گەلی ئەڵمانی بگاتە ئەو باوەڕەی کە لە ڕوی بیر و جەستەوە لە تەواوی گەلان سەرترە، ئەو گەلانەی کە لە جولەکەوە سەرچاوەیان گرتوە. ئەمەش سەرتایەك بو بۆ دروست بونی تیۆرەی سەروەری ڕەگەزی ئەڵمانی.هەروەها ڕیتەر ئاماژە بەوە دەدات کە زۆر گرنگە گەلی ئەڵمانیا هەست بە سەروەری خۆی بکات لە ڕوی بیرو جەستەوە بەسەر گەلانی دیکەدا کە سەرجەمیان لە جولەکەوە سەرچاوەیان گرتوە. ئەوە ئەو بیرۆکەیە بو کە بانگەشە کەرانی ڕەگەزی ئاری تیۆرەی ڕەگەزی ئاری باڵایان لەسەر بنیات نا، ئەو تیۆرییەی کە گرتیانە خۆیان تا ڕووبەڕوی ئەو بانگەشە ببنەوە کە جولەکەکان بڵاویان ئەکردەوە لەسەر ئەوەی کە ئەوە ئەوانن کە لە لایەن خوداوەندەوە هەڵبژێردراون تا دەست بگرن بەسەر تەواوی ئەوەی لەسەر زەوی

هەیە... بەم شێوەیە بە ملیۆنەها مرۆڤ دابەش بون بەسەر و دو سەربازگەی دژ بەیەك کە یەکێکیان بانگەشەی سەروەری ڕەگەزی ئاری یاخود ئەڵمانی ئەکرد و ئەوی دیکەش بانگەشەی بۆ جولەکە دەکرد.

٢. کارل ڕیتەر بنەمای سیاسەتێکی دارایی دامەزراند و داوای کرد لە پەیڕەو لێکرانی ڕێگری بکەن لە خاوەن بانکە جیهانیەکان کە دەست بگرن بەسەر ئابوری ئەڵمانیا و ئەو دەوڵەتانەی کە سەر بەون هەر وەك چۆن دەستیان گرت بەسەر ئابوری ئینگلتەرا و فەڕەنسا و ئەمەریکا.

٣. ریتەر پێشنیاری دروست کردنی ئابوری پێنجی نازی کرد[٢٩] تا ڕوبەڕوی ئابوری پێنجی کۆمۆنیزم و ڕێکخراوە نهێنیەکان ببێتەوە و تا ئەرکی ڕازی کردنی چینە ناوەند و باڵاکان لەئەستۆ بگرێت لەو وڵاتانەی کە دەیەوێت ملکەچیان بکات بەوەی کە نازیزم تەنها ئامرازە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی کۆمۆنیزم، تا دۆخ ئامادە بکات بۆ پیشوازی کردن لە سوپای ئەڵمانیای نازی بەو پێیەی کە سوپایەکی دۆستە و هاتوە تا ئەو وڵاتە بپارێزێت لە مەترسی کۆمۆنیزم، لە هەمان کاتدا هۆشداری دەداتە سەرکردە نازیەکان تا خۆیان بەدور بگرن لە داگیر کردنی وڵاتەکەلی دیکە تا ئەو کاتەی کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ئابوری پێنجەم ئامادە کاری ئەکەن بۆ ئەو داگیرکردنە و زۆرینەی جەماوەر ڕازی ئەکەن بەوەی کە ئەو هێرشە بۆ ڕزگار کردنە نەوەك بۆ داگیر کردن. کاتێکیش کە هیتلەر بە پێچەوانەی ئەو بنەمایانەی ڕیتەر هەڵسوکەوتی کرد، سەرکردە ئەڵمانیەکان ریستیان تیرۆری بکەن سەرباری ئەوەی کە ئەوە هەر ئەوان بون کە گەیاندبویانە ئەو پۆستە.

٤. کارل ڕیتەر جەخت لە تێکشکاندنی تەواوەتی کۆمۆنیزم و ڕیشەکێش کردنی جولەکە ئەکات و ئەڵێت: بۆ ئەوەی سەرکردە ئارییەکان بگەنە ئەوەی کەدەست بەسەر بوارەکانی کارکردن بگرن لەسەر ئاستی جیهان هیچ ڕێگەیەکی دیکەیان لەبەر دەمدا نیە جگە لەو کارە... جەخت لە پێویستی ئەو دو هەنگاوە

---

([٢٩]) لە تەواوی وڵاتانی ڕۆژئاوا پارتی نازی بونی هەیە و یەکێتییەکی جیهانی پێکیانەوە ئەبەستێتەوە.

ئەکات و بەڵگەی مێژووی ئەهێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە کۆمۆنیزم شتێك نیە جگەلە داردەستێك بە دەست خاوەن بانکە جیهانیەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان. پلانەکەی ڕیتەر چەند خاڵێکی دیکە لە خۆ ئەگرێت بەڵام ئێمە پەسەندە ئەکەین بەوەی کە باسمان کرد تا دەرگا داخراوەکە بکەینەوە و ڕۆشنایی بخەینە سەر ئەو پلانە نهێنییەی کە لە پشتیەوە سەرچاوە ئەگرێت و دو لەلایەن ئەخشەیان بۆ کێشاوە کە خاوەن بیرێکی بێ باوەڕن و ئامانجیان ستمکارییەکی سەرتاپاگیرە. لێکۆڵینەوەی بەراورد کاری ئایینەکان و زانستی جیۆسیاسی و ئابوری سیاسی سەرباری چەند ساڵێك لێکۆڵینەوە ئەو ڕاستییەیان بۆ دەرخستم کە بە ملیۆنەها مرۆڤ چ لە ڕابوردو چ لە داهاتودا شتێك نەبون جگە لە بەرد گەلێك لەسەر تەختەی شەترەنج بەدەست سەرکردەی ئەو دو لایەنەوە، ئەو دو لایەنەی کە لە بیرۆکەی مادیگەرای بێ باوەڕو بیرۆکەی ستەماکاری سەرتاپاگیرەوە سەرچاوەی گرتوە. ئەو دو لایەنەش بەردەوام ئەبن لەسەر گەمە ناشرینەکەیان لەسەر تەختەی شەترەنج تا ئەو کاتەی کە یەکێك لە لایەنەکان ئەوی دی لەناو ئەبات.

هەروەها لەم کتێبەدا بە بەڵگەوە ئەوەئەخەینە ڕو کە قۆناغەکانی ئەو گەمەیە لە ڕابوردودا چۆن بوە و ئەو جوڵانەوانە چییە کە پێش بینی ئەکرێت لە داهاتودا ڕو بدات .

ئاسانترین ڕەوش بۆ گەیشتن لەوەی کە ڕو ئەدات لە جیهانی ئەمڕۆدا ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە بکەین لە ڕوداوەکانی مێژوو لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی کە باسمان لێوە کرد، بەوپێیەی کە جوڵەگەلێکن لە گەمەی بەردەوامی شەترەنج... بەو پێیەی کە بازنەگەلێکن لە جەنگی بێ کۆتایی چاکە و خراپە، نورانیەکان جیهانیان دابەش کردبو بەسەر دو سەربازگە وکردبویانە شوێنی گەمەی خۆیان، لەو گەمەیەشدا پڕوپاگەندە و ئایین و گەلان بەکار ئەهێنن و تەنها وەك پارچەیەك لە جوییم لە مرۆڤایەتی ئەڕوانن کە ئەیانەوێت بیهێننە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و هیچ دەربەست نین لە بەقوربانی کردنی مرۆڤەکان و هەڵگیرساندنی جەنگ لە پێناو ئامانجەکانی خۆیاندا... هاوشێوەی وەزیر و ئەسپ و شا لە

گەمەی شەترەنج دا، شا و وەزیر و پیاوانی ئاینی ناو حکومەتەکان ئەجولێنن و گەلیش وەك سەربازەکانی ئەو گەمە ئەجولێنن.

ڕەقی نورانیەکان لەوەدا دەرئەکەوێت کە وەك بەرد گەلێکی گەمە لە مرۆڤایەتی ئەڕوانن کە هەرچۆنێکیان بوێت گەمەی پێ ئەکەن، بۆنمونە ڕەنگە لە پێناو نزیك بونەوەی هەنگاوێك لە ئامانجەکەیان بەردێك بکەنە قوربانی... هەروەك پێشتر باسمان لێوە کرد ئەمە ئەو ڕەوشە ئەگریسەیە کە بەکاری ئەهێنن بۆ زاڵ بون بەسەر جیهاندا.

لە شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیپرۆفیسۆر کارل ڕیتە ئاماژە بەوە ئەدات و ئەڵێت کە قۆناغی ئێستای گەمەکە لە کۆشکی بانکدار (ئامشیل مایر بارەن) کە زیادتر بە ناوی (ڕۆتشیلد)ەوە ناسراوە دەستی پێکرد[٣٠].

لە شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیا لەو جێگەیەی کە سیانزە بازرگانی ئاڵتون و زیو کۆ ببونەوە بڕیاریان دا کە تەنها ڕێگەی بەردەمیان بۆ دابین کردنی دەسەڵاتی ڕەهایان لەسەر سامانی جیهان و وزە مرۆڤانەکەی وا ئەخوازێت لێیان کە یەکەم: تەواوی سەرکردەکانی ئەوروپا تێك بشکێنێت و تەواوی حکومەتەکانی ئەو کاتە بڕوخێنێت و تەواوی ئایینەکانیش لەناو ببرێن و بنەماکانی ستەمکارییە ئەهریمەنیەکەیان دابمەزرێنن... ئەوان پێیان وابو کە بۆ ئەو کارە پێویستە کە مەتریالیزیمی مێژویی و دیالکتیك بەکار بهێنن بۆ بەئەنجامگەیاندی کارەکەیان.

تەواوی بازرگانەکانی ئاڵتون جولەکە نەبون، بەڵکو هەندێك لەو سوخۆرانە جولەکە نەبون. لە هەمویان دەوڵەمەند تر خاوەنی کۆمپانیای لەندەن سیتی بو کە لەساڵی ١١٣٠ دامەزرابو. هەرچەندە ئەم بۆچونە ڕەنگە سەیر بێتە پێش چاو بەڵام مێژوو بۆمان ئەسەلمێنێت کە سەرکردە جولەکەکان و جرمانیەکان

---

(٣٠) خانەوادەی ڕۆتشیلد زۆر بەناوبانگە. خانەوادەیەکی جولەکەن لە شا جیهانیەکانی پارە، چەندین ساڵە دەستیان گرتوە بەسەر کەرتی گەورەی دارایی و ئابوری و بازرگانی پیشەسازی گەورە لە سەرتاسەری جیهاندا.

پێکەوە یەکیان گرت کاتێك کە پێویست بو لە دژی دوژمنێکی هاوبەش کە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی و ئاینی مەسیحی بو.

ئەو کاتەش کە مرۆڤایەتی دەرگیر بون لەگەڵ یەکدی، ئەوە نورانیەکان بون کە وەك هێزێکی شاراوە شەڕەکانیان بەرێوە ئەبرد تا ئەو پەڕی سود بەرن لە داهاتودا.

سەرکردەکانی نازیزم وکۆمۆنیزم یەکتریان دەست خەڕۆکرد بەلام هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەوان دواتر بۆیان دەرکەوت کە شتێك نەبون جگە لە یارییەك بەدەست نورانیەکانەوە، ئەوانەی کە سڵ لە هیچ شتێك ناکەنەوە بۆ پێشبرنی ئامانجەکانیان.. . کاتێکیش کە کەمترین گومان لە لای ئەو هێزانە دروست ئەبێت لە سەر سەرکردەی یەکێك لە سەربازگەکان لە بەر ئەوەی زیاد لە پێویست ئەزانێت، ئەو کاتە بریار ئەدەن کە پاکتاو بکرێت...

ئەم کتێبە ئەوە ئەسەلمێنێت کە سەرکردەکانی ئەو دو سەربازگەیە کە زەینێکی ستەمگەرانەیان هەبو ئەخشەی زۆرێك لە تاوانەکانی تیرۆریان داڕشتوە بە نهێنی و بونەتە هۆی هەڵگیرساندنی زۆرێك لە شەڕ و شۆڕەکان و بە ملیۆنەها کەس تیایدا بونەتە قوربانی سەرباری ملیۆنەها بریندار و سیما شێواو و بێ لانە و ئاوارە.

ئایا ئەتوانیت سەرکردەیەکی سەربازی بدۆزیتەوە کە بتوانێت پاساو بهێنێتەوە بۆ خستنە خوارەوەی بۆمبی ئەتۆمی بەسەر هێرۆشیما و ناکازاکی کە بوە هۆی کوشتنی سەد هەزار کەس لە چاو تروکاندنێك دا... دوهێندەی ئەو ژمارەیەش برینداری ترسناکی لێ کەوتەوە.

لە کاتێکدا ئەم بریارە درا کە هێزە سەربازیەکانی یابان لەوەدا بون کە خۆیان بدەن بە دەستەوە تەنها چەند ڕۆژێکی کەم مابو تا بە تەواوەتی ئەو کارە ئەنجام بدەن.

تەنها لێکدانەوەی لۆژیکیانە بۆ ئەو کارە ئەوەیە کە هێزە شاراوەکان، ئەو هێزانەی کە دەستیان گرتبو بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە گەلەکاندا ویستیانئەو چەکە پڕ مەترسیە نمایش بکەن لە پێش چاوی ستالین تا بیرۆکەیەکی بداتێ

لەسەر ئەوەی کە ڕەنگە بەسەری بێت گەر پێ لە بەرەکەی خۆی زیادتر ڕا بکێشێت . ئەمە تەنها پاساوە بۆ ئەو تاوانەی کە دژ بە مرۆڤایەتی کرا.

ئەڵبەتە چەکی ئەتۆمی و چەکی هایدرۆجینی ئێستا ئیدی ترسناکترین چەکی کۆمەڵ کوژ نین بەڵکو شان بە شانی ئەو چەکانە گازی کۆئەمار، ئەو گازەی کە ئەتوانێت ژیانی هەر زیندەوەرێك لە هەر ناوچە و شار و وڵاتیك دا پەك بخات، ئەو چەکەی کە هەردو سەربازگەی کۆمۆنیزم و ئەو سەربازگەیەی کە کۆمۆنیزم نیە دەستیان داوەتە ئەمبار کردنی.

سڕینەوەی شوێنەواری ژیانی مرۆڤایەتی لە ناوچەیەك کە ئێستا ئەتوانرێت لە ڕێگەی گازەوە ئەنجامبدرێت پێویستە لە ڕوی سەربازی و ئابورییەوە کاری بۆ فەراهەم بکرێتتا ئەو لایەنانەی کە بەکاری ئەهێنن بگەن بە ئامانجەکانیان.

وەك دەرکەوتوە ئەو گازە لە فلۆرین پێك دێت، ئەو گازەی کە زۆر چڕە و بە یەکێك لە هەرە مەترسی دارترین ئەو گازانە دادەنرێت کە مرۆڤ دۆزیویەتیەوە. ئەم گازە بێ بۆن و بێ ڕەنگ و بێ تامە و لەڕوی تێچونەوە بەرهەم هێنانی کەمی تێ ئەچێت. تەنها تنۆکێکی گەر بەر جەستە بکەوێت بەسە تا کۆئەندامی هەناسە پەك بخات و ببێتە هۆی مردن تەنانەت گەر ئەو تنۆکە ئاوە لە ڕێژەیەکی زۆری ئاو و ڕۆندا تێکەڵ کرابێت. هەروەها ئەو تنۆکە ئەتوانێت لەماوەی چەند خولەکێك دا ئەو جلە ببڕێت کە پیاوانی ئاگر کوژێنەوە لەبەری ئەکەن.ئەڵبەتە ئەو گازە زیان بەشتە نازیندوەکان ناگەیەنێت.

هێزە نازیەکان ئەتوانن دوای چەند ڕۆژێك لە بەکار هێنانی ئەو گازە، ناوچە ئالودەکان بە بێ مەترسی داگیر بکەن، ئەو کاتە ئیدی ئەو ناوچانە ژیانی تێدا نامێنێت بەڵام باڵەخانە و ئامێرەکان وەك خۆی ئەمێنێتەوە، تەنها خۆپارێزیش بۆ خۆپاراستن لە گازی دەمار ئەترۆپینە، بەڵام ئەبێت دوای دوچار بون بە گاز چەند جارێك لە ڕەگی کەسی بەرکەوتو بدرێت، ئەڵبەتە ئەم شێوازە زۆر کارا نیە لەو جێگایانەی کە دانیشتوانی زۆری تێدا دەژی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردو بەرەی کۆمۆنیزم و نازیزم بە ئەندازەی پێویست لەو گازەیان هەیە و هەر یەکەشیان ئەزانێت ئەوی دی چەندی هەیە ئەمەش وایان لێ ئەکات کە بە

ئاسانی بەکاری نەهێنن. هەر وەك زانراوە سروشتی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکە کاتێك ئەگاتە حاڵەتی نائومێدی پەنا ئەباتە بەر توند ترین ڕێگە چارەکان هەرچەندە بێ ڕەحمانەش بێت تەنها لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکەی. هەروەك زانراویشە لە مێژوودا بە ملیۆنەها کەس کراوە بە قوربانی بە پیاو و ژن و منداڵەوە کاتێك کە زانراوە بەو کارە هەنگاوێك لە ئامانج نزیك ئەبنەوە، لێرەدا پێویستە ئەو پرسیارە بکەین کە تا کەی ئەم ململانێیە بەردەوام ئەبێت کە دوا جار تەواوی مرۆڤایەتی ئەگرێتەوە.

بێگومان ئەم پرسیارە لە ناخی هەر مرۆڤێکدا هەیە و ڕەنگە زۆرجار دو کەس کە تازە ئەچنە پرۆسەی هاوسەر گیرییەوە ئەو پرسیارە لە خۆیان بکەن ئایا ئەبێت منداڵێك بهێننە ئەم ژیانەی کە پڕیەتی لە ڕق و کینە.

لە ئینجیلی مەتیدا وەڵامی ئەوە ئەدۆزینەوە لەسەر ئەوەی کە ڕەنگە کۆتایی ئەم ژیانەدا چۆن بێت کاتێك دەڵێت ئەم ژیانە چۆڵەوانییەکە کە ژیان تیایدا نەماوە و هیچ گیانەوەرێك ڕزگای نابێت لەبەر ئەوەی ئەو چڵە خراپە چرۆی کردووەو تەنها پێویستی بە یەك جەنگە تا لایەنەکان چەکی ئەتۆمی و هایدرۆجینی و گازی دەمار بەکار بهێنن و ئەو کاتە تەنها خواوەند ئەتوانێت مرۆڤایەتی ڕزگار بکات.

لەم سەردەمەی ئێستاماندا بۆتە شتێکی باو کاتێك کە کەسانێك بە ئاگا یاخود بێ ئاگا گلەیی لە خوا ئەکەن و ئەڵێن کە ئەو هۆکار بوە تا مرۆڤایەتی ئەم حاڵەی بەسەر بێت، بەڵام کەسە ژیرەکان ئەزانن کە خواوەند هیچ بەرپرسیار نییە لەم دۆخە لەبەر ئەوەی ویستێکی ئازادی پێ بەخشیوین و ڕێنمایی کردوین بۆ ڕێگەی ڕاست و هیچ شتێك نییە کە ئێمە ئەوی لەسەر لۆمە بکەین تەنها خۆمان نەبێت لەبەر ئەوەی ڕێگەی دادوەریمان بەجێهێشتوە و ڕێگەمان بە هێزەکانی خراپە داوە کە زاڵ بێت بەسەر جیهانەکەماندا، لەو بارەوە ئەدمۆند بۆرك ئەڵێت: (تەنها شتێك کە لایەنگرانی خراپە پێویستیان پێ یەتی ئەوەیە کە لایەنگرانی چاکە هیچ نەکەن).

لێکۆڵینەوەی بەراورد کاری ئاینەکان لە بارەی ڕوداوەکان پێمان ئەڵێن کە ئەوانەی کە باوەڕیان بەو دنیا هەیە باوەڕێکیان هەیە لەسەر بنەمای خۆشویستن و هیوا، بەڵام بێ باوەڕی ڕەها لە سەر بنەمای نا ئومێدی و ڕق بنیات نراوە. شتێکی دیکەش هەیە: زانست هەوڵێکی هاوشێوەی ئەوەی بە خۆوە نەبینیوە کە لایەنگرانی بیروبۆچونی مادیگەرا لە ساڵی ١٨٤٦ەوە بە خۆوە بینیویانە کاتێک کە (ك. تولویك) و (ك.برادلاف) بۆچونی خۆیان کورت کردەوە بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

(پێویستە هەوڵی مرۆڤ لە پێناو بەرژەوەندییەکانی دا تەنها پەیوەندی دار بێت بەم ژیانەیەوە، لایەنگرانی بیری مادیگرا و لە پێشیانەوە پەیامبەرە ساختەکانی هاوشێوەی کارڵ مارکس و لینین و ستالین و موسولینی و هیتلەر کە هەستان بە هەڵ خەڵەتاندنی ملیۆنەها مرۆڤ بەوەی کە بەڵێنی ژیانێکی دیکەیان پێدابون، لە نێویشیاندا مەسیحی گەلێکی زۆر هەبون کە ڕاستگۆبون لە ئاینەکەیاندا و نەبوایە کە خاوەن درکێکی گەورەتر بونایە).

## بەشی دووەم

# شۆڕشی ئینگلیز

هێزەکانی خراپە باش لەوە گەیشتون کە تەنها ڕێگەیان بۆ دەسەلاتی ڕەها بە سەر جیهاندا و دواجار دامەزراندنی دیکتاتۆری مادی گەرای بێ باوەڕ لەسەر بنەمای نەهێشتنی تەواوەتی سیستەمەکانی ئاکار و یاسا لە لایەك و نەهێشتنی تەواوی ئاینەکان لە لایەکی دیکەوە دەبێت، ئەم هێزانە بڕیاری ئەوەیان داوە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان پێویستیان بە نانەوەی کێشە و دوبەرەکی و کینەیە لە نێو گەلان و وێرانکردنی پایەکانی ئاکاری هەر کۆمەڵگایەك، هەر واشبو کە شەڕێکی قورس لە نێوان هەردو ڕەگەزی جولەکە و ئارییەکان ڕویان دا کە تەنها خزمەتی مادی گەراکانی ئەو دو سەربازگەیەی کرد، ئەگەر هەر دو ڕەگەزی جولەکە و ئاریەکانیش بیانتوانیایە کە پارێزگاری لە ئاینە سەرەکیەکەیان بکەن هیچ کات هێزەکانی خراپە نەیان دەتوانی ئامانجە خراپەکانیان خۆیان بهێننە دی.

کە دەڵێین ئاری مەبەست مان ئەو کۆمەڵە زمانەیە کە ناسراوە بە زمانە هندوئەورپیەکان یاخود هیندۆجەرمانی، ئەم کۆمەڵەیەش دابەش دەبێت بەسەر دو هۆبەدا: هۆبەی ئەورروپی یاخود رۆژئاوا و هۆبەی ڕۆژهەلات کە لە خۆ گری چەندین زمانە لەوانە ئەرمەنی. زمانە ئاریەکانش خاڵێکی هاوبەش هەیە لە نێوانیاندا کە ئامارژەیە بۆ سەرچاوەی سەرەکیان کە هاوبەشە، بەلام وشەی ئاری لە ڕاستیدا ئامارژەیە بۆ مانایەکی دیکە لە ئەورروپا بە شێوەیەك کە

ئاماژەیە بۆ (جێرمان وەك سەروەری زەوی) سەرچاوەی ئەم مانایەش ئەگرێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆربەی سەرکردە ئارییەکانی ئەوروپا لەو کەسە خاوەن زەوی و زار و دەست ڕۆیشتوانە بون کە ڕاهاتبون لەسەر ئەوەی خۆیان بەهێزی چەکدار دەورە بدەن تا خۆیان موڵك وماڵیان بپارێزێت. سەروەرانی جەنگی ئاریش لەوانەوە سەرچاوەیان گرتوە، سەرکردە نازیەکانی فاشیزم و دژایەتی جولەکەیان بەکار هێناوە بۆ خزمەت کردن بە ئامانجەکەیان کە ئەویش ملکەچ کردنی جیهانە بۆ ڕەگەزی ئەڵمانی.

باوباپیری ئارییەکان لە دێر زەمانەوە هاتونەتە ئەڵمانیا لە بەرزاییەکانی (بامیر)ی ئاسیا. بەشە سەرەکیەکانیان پێك دێت لە تیوتۆنی و ڕۆمانی و سلاڤی، ئەڵبەتە تورکەکان هەنگاریا و فنلاندیەکان ئاری نین.

کۆمەڵەی سامیەکانیش دابەش دەبن بەسەر دو بەشدا: بەشی یەکەم گەلانی ئاشوری و فینیقی و ئارامی عبرانیەکان ئەگرێتەوە و بەشەکەی دیکەش عەرەب و ئەسیوبی یەکان ئەگرێتەوە، عەرەبەکان لەڕوی ژمارە و پێگەیەناوە بە پلەی یەکەم دێن بەڵام ئارامیەکان لە سەرجەمیان هەژار ترن و عبرانیەکانیش لە ناوەڕاستی ئەم دو بەشەدان[٣١].

ئێمە ئەمڕۆکە ناوی جولەکە بە شێوەیەکی ناڕون لە هەر کەسێك ئەنێین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان چوبێتنە سەر ئاینی جولەکە بەڵام لە ڕاستیدا زۆرێك لەوانە بەپێی سەرچاوەی ڕەگەزەکەیان سامی نین لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەوەی کە چونەتە سەر ئاینی جولەکە لە هرودینەکانن ئەوانەی کە لەئایدیۆمییەکانەوە سەرچاوەیان گرتوە کە خوێنیان سەرچاوەیەکی تورکی – مەغۆلی تێدایە[٣٢].

---

([٣١]) بۆ زانیاری زیادتر لەو بارەوە سەیری ینسکلۆپیدیا ی بەزی ئاسراو بکە (پ ٥١٤ و پ ٦٤٧).

([٣٢]) سەیری ئینسکلۆپیدیای جولەکە بکە پەڕەی ٤١: ئایدیۆمیەکان جولەکەی نوێن هەروەك چۆن ڕۆفیسۆری بەناوبانگ (اوتروب ستودارد)یش ئەڵێت کەڕەچەڵەك ئاسێکی بەناوبانگە. سەرچارە جولەکەکانیش بۆخۆیان دان بەوەدا دەنێن کە (٨٢٪)ی ئەو کەسانەی کە پەیوەست بون بە جوڵانەوەی زایۆنیزمی سیاسیەوە ئەشکەنازی بون واتە ئەو جولەکانی کە سامی نین و هیچ پەیوندییەکیان لە ڕوی ڕەگەز و مێژوەوە بە فەڵستین نیە هەر لەو بارەشەوە بۆچونی زۆر هەیە.

ئەوەی كە لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیەكە هەمیشە لەناو سەركردە جولەكەكاندا – هەر وەك چۆن لەناو سەركردە ئارییەكاندا –ناواخنێكی بچوكی سەخت هەیە لەو كەسان پێك هاتوە كە بێ باوەڕن و هەڵپەیەكی شێتانەیان هەیە و بە ڕوكەش بانگەشە بۆ جولەكە (یاخود بۆ مەسیحیەت لە لای ئاریەكان) دەكەن بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان باوەڕیان بە هیچ ئاینێك نیە و سەر بە هیچ نەتەوەیەكیش نین بەڵام ئەمەش ڕێگریان لێ ناكات كە نەتەوەكان و بنەمان نیشتیمانیەكان بەكار بهێنن بۆ گەیشتم بە ئامانجەكانیان كە كورت دەبێتەوە لە دەسەڵاتی ئابوری و سیاسی زیادتر. ئامانجی كۆتایی سەركردەكانی هەردو كۆمەڵەكە یەكە. ئەوان سورن لەسەر ئەوەی بكەنە دەسەڵاتی ڕەها بەسەر ئابوری جهان و سامانە سروشتیەكان و دەستی ئیشكەر تیایدا و دواجار كردنی جیهان بە دەوڵەتێكی ستەمكار كە تەنها باوەڕی بەیەك خواوەند هەبێت كە ئەویش خواوەندی دەوڵەتە.

لە سەدەی یەكەمی زاینیەوە ڕەگەزی تورك – فنلاندیەكان و ئەوانەش كە سامی نەبون لە ئاسیاوە دەهاتنە ئەوروپا لە ڕێگەی باكوری دەریای قەزوینەوە، بە دانیشتوانی ئەو ناوچە بت پەرستانەش دەوترا خەزەر. ئەمانە لەو پەڕی ڕۆژهەڵات ئەوروپا نیشتەجێ بون و شانشینی خەزەری بەهێزیان دروست كرد و لە ڕێگەی هێرشە داگیركاریەكانیانەوە دەسەڵاتیان ڕوی لەزیاد بون كرد تا لە كۆتایی سەدەی هەژدەهەم توانیان دەست بگرن بەسەر زۆربەی ناوچەكانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا لە پشت شاخی ئوراڵ و باكوری دەریای ڕەش، ئەو كاتە خەزەریەكان چونە سەر ئاینی جولەكە و پێیان باشتر بو لە مەسیحیەت و ئیسلام و هەستان بە دروست كردنی كڵێسا و خوێندنگە بۆ فێركردنی ئاینی جولەكە لە تەواوی بەشەكانی وڵاتەكەیاندا، خەزەریەكان لە تروپكی هێزیاندا توانیان زیادتر لە بیست گەل و هۆز بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و ناچاریان بكەن كە سەرانە بدەن، دەوڵەتەكەشیان تا نزیك بە (٥٠٠) ساڵ تەمەنی كرد تا لە كۆتایی سەدەی سیانزەهەم لەسەر دەستی ڕوسەكان ڕوخا ئەوانەی كەلە باكورەوە هاتنە خوارەوە لەكۆتایی سەدەی دەهەمی زاینیەوە و دواجار بەسەر

خەزەریەکاندا سەرکەوتن لەدەرەنجامی شەڕی درێژخایەن و تا دواجار لەناو ڕوسەکاندا توانەوە، بەڵام گڕی ڕق ناو دڵی خەزەریەکاندا هەر بڵێسەی هەبو و بەردەوام بو لە دڵی قەشەکانیاندا و تاوای لێ هاتن کە حەزی تۆڵەسەندنەوە بە درێژایی چەند سەدەیەك ببێتە باوەڕێك کەلەسەر بنەمای وێرانکردن و ئازاردان دامەوزراوە. ئەم هۆکارانە پاڵی بە جولەکەکانی ڕوسیاوە نا تا خۆیان بەدور بگرن لە گەلەکانی دیکەی ڕوسیا لە کەشێك دا کە ڕقێکی زۆر تیایدا باڵادەست بو، لە کشێکی لەو چەشنەدا سروشتی بو کە گەل پڕ بە کینە و ترسەوە لە جولەکەکان بڕوانن ئەمەش بوە هۆی ئەوەی بە درێژای ساڵانێك ببێتە هۆی لێك دورکەوتنەوە لە نێوانیاندا، ئەم ڕوداوانە نهێنی بونی ئەو ژمارەی زۆرەی جولەکەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە لە سەدەی سیانزەهەمەوە لە ناوی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا دەژین.

ڕق و کینە لە لای جولەکەکانی خەزر لە هەڵپەی زۆریان بۆ کۆکردنەوەی ئاڵتون ڕەنگی دایەوە دوای ئەوەی کە ئاڵتونیان کردە ئامانجی ژیانیان و بە هەمو شێوەکان هەوڵیان بۆ داوە لەو ڕێگەیانەش سوخۆری کە پێی بەناوبانگ بون، هەروەها لە لایەکی دیکەوە خەونی تۆڵە سەندنەوە لە لای قەشەکانیان دروست بو و لە پلانە ترسناکەکانیان و جوڵانەوەی شۆڕشگێڕی ڕەنگی دایەوە، ئەو شۆڕشەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە خەونیان پێوە دەبینی تا لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ دا ڕەنگی دایەوە.

جولەکەکانی خەزەر لەو ماوەیەدا دوچار هێرشی توندی چەوساندنەوە بون لە لایەن جەماوەری مەسیحی ڕوسیاوە، ئەڵبەتە ئەوەی بەرپرسیاری یەکەم بو لەم دۆخە ئەو کۆمەڵگەیە بو کە لەسەرەوە قەشە و سوخۆرەکان بەڕێوەیان ئەبرد لەبەر ئەوەی هەر ئەم کۆمەڵگەیە بو کە هەستی کینەی لەلای هەموان دروست کرد لەبەر ئەو عەقڵیەتە کینەوەرزەی لەناو جولەکەکاندا چاندبوی و دواجار لەبەر ئەو گۆشەگیرییەی کە هەیانبو سەرباری شێوەکانی سو خواردن کە لە ڕێگەیەوە سوخۆرەکان توانیبویان سامانێکی زۆر پێکەوە بنێت... مێژوو لە وردەکارریەکانیدا ڕاستیەکی حاشا هەڵنگرمان پێدەڵێت: کۆمەڵگەی جولەکە

ئەم هەڵوێستەی وەرگرتبو لەبەر ئامانجێکی دیاری کراو تا ئەو کینەیە بەکار بهێنێتەوە کەلە ناو دڵی جولەکەکاندا دروست دەبێت بە هۆی چەوساندنەوە تا ئەو هەستی کینەیە بگۆڕێت بۆ ئەوە کە کەسی جولەکە سڵ لە هیچ نەکاتەوە و بیرۆکەی لەناو بردن قبوڵ بکات.

ئەم شێوازە پیلان گێڕییە بە درێژایی چەندین نەوە گۆڕانی بەسەردا نەهات و نورانیەکان بە درێژایی چەندین سەدە و لە چەندین کیشوەردا لەگەڵ خۆیاندا هەڵیان گرتبوو، ئەڵبەتە هەر سەرانی خراپەی قەشە جولەکەکان بون کە ڕوبەڕوی پێغەمبەرەکان بونەوە و شەڕیان لەگەڵ هەر جوڵانەوەیەکی چاکسازیانەدا ئەکرد... ئەم ڕاستیەش لە دروست بونی ئاینە ئاسمانیەکان و ژیانی پێغمبەرەکانەوەبەدەستمان دێت و بەڵگەیە بۆ بەردەوام بونی پیلانگێڕی جیهانی سەدە لە دوای سەدە و نەوە لەدوای نەوە لەلایەن نورانیەکانەوە... ئەگەر وردبینانە چاو بە مێژوودا بخشێنین بەڵگەی دروستمان دەکەوێتە بەردەست لەسەر ئەم ڕاستیە بە تایبەت کاتێك کە دیاردە لێك چوەکان لە نێوان ڕابوردو ئێستا ببەستینەوە بەیەکەوە.

ڕەنگەدیاردەی یەکەم کە سەرنجمان ڕادەکێشێت کۆبونەوەی جولەکە سوخۆرەکانە بوە بە درێژایی مێژو لە ئیمپڕاتۆریەت و دەوڵەتە زلهێزە پێشکەوتوەکان لە ڕابوردو و وڵاتە یەککرتوەکانی ئەمەریکا لە حاڵی حازردا، ئەگەر لە ئیمپڕاۆریەتی ڕۆمانیەوە دەست پێ بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە فەیلەسوفی گەورە سینکا (٤ پێ زاین و ٦٥ دوای زاین) لەبەر ئەوەی هەوڵی دا پەردە لەسەر دەسەڵاتی خراپی جولەکە سوخۆرەکان هەڵماڵێت ئەوانەی کە هاتبونە ناو ڕۆماوە، سینکا مامۆستای نیرۆن بو کاتێکیش کە نیرۆن بۆ بە ئیمپڕاتۆر ئەم فەیلەسوفە بو بە هاوڕێ و ڕاوێژکاری بەڵام نیرۆن دواتر (بوبیا)ی کردە هاوسەری کە داردەستی کۆمەڵەی سوخۆرەکان بو و ئەمەش هۆکار بو تا ئیمپڕاتۆر بکاتە مل کەچی ئەوان و بەم شێوەیەش نیرۆن بوە خوێنڕێژترین دەسەڵات دار لە مێژوودا و کەسایەتی زۆر هاتە خوارەوە تا ئاستی ئەوەی کە پێی بوترێت کەسێکی شێت بە شێوەیەك کە تەنها بۆ ئەوە ئەژیا کە وێران بکات

و ئەشکەنجە بدات و خوێن بڕێژێت تا وای لێهات لەنێو خوێن و شەهوەت ڕانیدا نوقوم بو و دواجار سینکا نەیتوان هیچ جۆرە کاریگەرییەکی لەسەر دا بنێت... کاتێکیش نائومێد بو لەوەی کەبیهێنێتەوە سەر هۆشی خۆی بە ئاشکرا هێرشی دەکردە سەری و لە بەر چاوی گەل کارە ناشرینەکانی سوخۆرەکانی ئاشکرا ئەکرد و باسی لە دەسەڵاتی سوخۆرەکان ئەکرد بەسەر نیرۆنەوە و ئەمەش پاڵی بە سوخۆرەکانەوە نا تا داوا لە نیرۆن بکەن کە سینکا لە ناو بەرێت. نیرۆن نەیوێرا ئەو کارە بە ئاشکرا بکات لە ترسی ئەوەی ئەوەکا گەل لە دژی هەڵبستن هەر بۆیە ناچاری کرد کە خۆی بکوژێت.

ئەمەش یەکەمین حاڵەتی بەناوبانگ بو کە تیایدا سوخۆرەکان کەسێك کە سەرئێشەی بۆ دروست کردبون ناچار بکەن کە خۆی بکوژێت، ئەڵبەتە دوا حاڵەتیش نەبو لەبەر ئەوەی بە درێژایی مێژوو چەندین چیرۆکی تیرۆرکردن و کوشتن هەیە کە خراوەتە قاڵبی خۆکوشتن و مردن بە ڕێکەوتەوە، ڕەنگە باشترین نمونەش بۆ ئەو حاڵەتە لە مێژوی هاوچەرخدا بێت: لە ساڵی ١٩٤٥ جیمس فۆرستال[٣٣] کە وەزیری بەرگری ئەمەریکا هێنرایە سەر ئەو باوەڕەی کە کۆمەڵێك لە بەڕێوەبەرانی بانك هەیە لە ئەمەریکا کە بە شێوەیەکی نهێنی کۆمەڵەیەکیان دروست کردوە لە خاوەن بانکە ئەمریکیەکان کە دەستیان گرتوە بەسەر باجی فەڕەنسا و ئینگلتەرا و وڵات گەلێکی دیکە هەروەها دوای پشکنینی چەند بەڵگەنامەیك و شیکار کردنی بۆی دەرکەوت کە خاوە سەرمایە جیهانیەکان سەر بە نورانیەکانن و هەر ئەوانیش بون کە بونەتە هۆکاری دروست کردنی هەردو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم، دوای زانینی ئەم ڕاستیانە هەوڵی دا کە ڕۆزفێڵت سەرۆك کۆماری ئەمەریکا و سەرکردەکانی دیکە لەم ڕاستیانە تێ بگەیەنێت. ئیدی ئێمە نازانین کە خۆکوشتنەکەی

---

(٣٣) جیمس فۆرستال کە وەزیری بەرگری ئەمەریکا بو بەیەکێك لە گەورە بەرپرساتی ئەمەریکا دادەنرێت کە بە شێوەیەکی لە ناکاو لە ساڵی ١٩٤٥ ڕایگەیاند کە دوچار بە تێك چونی باری دەرونی بوە کە دواتر بە شێوەیەکی فەرمی نێردرا بۆ یەکێك لە نەخۆشخانەکان و دواتر بە شێوەیەکی فەر می و تەنها دوای چەند هەفتەیەك ڕاگەیەنرا کە خۆی کوشتوە و بە تێپەڕ بونە کاتیش ڕوداوەکە هەر بە شاراوەیی مایەوە.

پەیوەست بوە بە نائومێدبونیەوە یاخود تیرۆرکراوە لە لایەن هەندێك لایەنەوە تا بۆ هەتا هەتایە ئەمی بەداخراوی بهێڵرێتەوە... دواتر بەرگی خۆکوشتن کرایە بەر تاوانەکە... لەمێژووشدا بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر تاوان گەلێکی گەورە کە ساختە کراوە لە وڵات گەلێکی جیاوازدا و دواتر بەرگی خۆکوشتن کراوە بە بەریدا.

# قۆرخکارییەکانی جولەکە بە درێژایی مێژوو دەرەنجامەکانی

کاتێك کە ئیمپڕاتۆری یاسا دانەر جۆستینان گەیشتە دەسەڵات (٤٨٣-٥٦٩ ز) لە ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتی یاسا بەناوبانگەکانی دەرکرد کە تیایدا هەوڵی دا سنورێك بۆ ئەو کارە نایاساییانە دابنێت کە جولەکەکان پەنایان بۆ ئەبرد لە بازرگانی دا، ئەڵبەتە جولەکە بازرگانەکان تەنها لایەن بون کە لەگەڵ نورانیەکان واتە خاوەن سەرمایەکان کاریان ئەکرد، ئەمەش وای کردبو کە لە پێگەیەکی باشتردا بن بە بەراورد بەو بازرگانانەی دیکە کە جولەکە نەبون، ئەو بوارەش کە سامانێکی زۆری پێ ئەبەخشین بواری بە قاچاخبردن و کاری نایاسایی بو بە شێوەیەك کە توانیان ڕکابەرەکان لە خۆیان دور بخەنەوە و تەواوی ئەو سنورانەش ببەزێنن کە یاساکانی جوستینان بۆی دانابون ئەڵبەتە لە هەمان کاتدا بەهەرەمەندیش بون لەو یاسایانەی کە دەیپاراستن، یاسای جوستینان تا سەدەی دەهەم سەرچاوەی سەرەکی یاسا بو و تا ئەمرۆکەش بە گرنگترین سەرچاوە دادەنرێت لە بواری مافەکاندا. ئینسکلۆپیدیای (فنك و فافناك)ی جولەکە، بەم شێوەیە باسە لە بازرگانە جولەکەکان ئەکات:

"جولەکەکانی ئەو سەردەمە تەواوی ئازادی ئاینیان هەبو و ڕێگەیان پێ درابو کە هەندێك ناوەندی تایبەت بە خۆیان هەبێت، لەو سەردەمەدا بازرگانی کردن بە کۆیلە بە گرنگترین سەرچاوەی جولەکە ڕۆمانیەکان دادەنرا بەڵام ئەڵبەتە دواتر یاساگەلێکی زۆر دەرکرا بۆ ڕوبەڕو بونەوەی ئەو بازرگانییە... هتد).

مێژو بۆمان ڕون ئەکاتەوە کە بازرگانە جولەکەکان و سوخۆرەکانیش تەنها کاری بازرگانی کۆیلەیان نەکردوە بەڵکو کاری بازرگانی مادەی سڕکەر و لەش فرۆشی و مادەی کهولیان کردوە و بازرگانی بۆن و خشڵ و مادە گران بەهاکانی دیکەشیان قۆرخکردوە بۆ خۆیان، هەروەها پەنایان بردۆتە بەر بەرتیل دان بە بەرپرسەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بۆ کڕینی ویژدانەکان لە پێناو دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان تا ئەو کاتەی کە بونە هۆی خراپ کردنی ئاکاری کۆمەڵگەی ڕۆمانی هاوشێوەی کۆمەڵگەی بیزەنتی هەر لە ڕێگەی بەرتیل دان، مادەی سڕکەر، مادەی ئەلکهولی و لەش فرۆشی. لێکۆڵینەوە کردن لە دەسەڵاتی جوستینان دەریدەخات کە ئەو بێ هودە هەوڵی داوە وەك ئیمپراتۆرێك بەر بەبەرەڵایی بگرێت و سنورێك بۆ چالاکییە وێرانکارییەکانی جولەکە دابنێت. ئەو هۆکارەی کەلە پشت گەندەڵ کارییەکانی ژیانی ئەمڕۆ هەیە لە شارە گەورەکاندا هەمان ئەو هۆکارانەیە کە پێشتر هەبوە، بەم شێوەیە ئەبینین کە مێژوو خۆی دوبارە ئەکاتەوە، هەروەها دیاردەیەکی نوێی دیکە دەبینین لەنێو ئەو ڕوداوەنەدا، لەو بارەوە مێژوو نوسی بەناوبانگی بەریتانی (ئێدوارد دگیون ١٧٣٧-١٧٩٤) باس لە کاریگەرییە خراپەکانی هەژمونی بازرگانە جولەکەکان ئەکات لە ڕۆما لە کتێبەکەیدا:"کەوتن و داڕمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی" بەو پێیەی کە ئەوان هۆکاری سەرەکی ئەو داڕمانە بون، هەروەها گلیۆن بۆبیا هاوسەری نیرۆن بە بەرپرسیاری سەرەکی ئەزانێت لە ئیمپرتۆریەتەکەدا بەو پێیەی کە ئەوە ڕۆڵی ئەو بو کە ڕێگەی خۆشکرد بۆ دەسەڵاتی جولەکەکان و ئەوانیش کەشێکیان بڵاو کردەوە لە ڕۆما کە تیایدا ڕۆمانەکان وەك کەسانی سەرخۆش و بێ باك بون بەرامبەر داڕمانی بەردەوامی شارستانیەتەکەیان، لە دوای ڕمانی یەکجارەکی ئیمپرتۆریەتی ڕۆمانیش دەسەڵاتی جولەکەکان گەیشتە ترۆپکی خۆی و بەوەش ئەورووپا چوە قۆناغێکی تاریکەوە، ئەو قۆناغەی کە مێژونوسەکان وەك چاخی تاریك یاخود چاخەکانی ناوەند ناوزەندی ئەکەن.

ئینسکلۆپیدیای بەریتانی لە بارەی بازرگان و سوخۆرە جولەکەکان ئەڵێت: "بازرگان و سوخۆرە جولەکەکان بەرەو ئەوە ئەڕۆیشتن تا بە شێوەیەکی یەك جارەکی دەست بگرن بەسەر ئەو بازرگانانەی خاوەن بەهرەی تایبەت بون، لەوێوە لەهەمو شوێنێك دا بڵاو بونەوە و هەر لەوێوە هۆگری زۆریان بۆ پارە دەرکەوت. بازرگانی لە چاخەکانی ناوەندا بە شێوەیەکی سەرەکی لەدەستی ئەواندا بوە بەتایبەت بازرگانی کۆیلە". هەر وەك دیاریشە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی مەزنترین سەرچاوەی زانستی یە لە بەریتانیا.

دەست گرتنی جولەکەکان بەسەر بازرگانی ئاڵوگۆڕکردن دا — چ بە یاسایی و چ بە نایاسایی — لە چاخەکانی ناوەندا زیادی کرد سنوری بەر فراوانتر بو و گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە ئابوری تەواوی گەلانی ئەوروپا بە بێ جیاوازی کەوتە دەستیانەوە، بە ڕونی ئەتوانین هەست بە کاریگەری دەسەڵاتی جولەکەکان بکەین کاتێك کە دەبینین دراوی پۆڵندی و هەنگاری کۆن نەخش و نوسینی عبرانی لەسەرە. هەوڵدانی زۆری جولەکە بۆ دەست گرتن بە سەر دراودا بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە جولەکەکان هەر لە دێر زەمانەوە دروشمێکیان قبوڵ کردبو کە دواتر ئامشل مابلو باوەر پێی بەناوبانگ بو (١٧٤٣-١٨١٢): "با ئێمە دراو لە یەکێك لە وڵاتەکاندا دەربکەین دواتر گرنگ نیە کە یاسای ئەو وڵاتە کێ دایدەنێت"، ئامشلۆ مابلو ئەو پێشنیارەی کرد بۆ هاوبەشەکانی لە جولەکە پیلانگێڕەکان تا ئەو پاڵنەرەیان بۆ دەربخات کە پاڵی بە چەند نەوەیەك لە نورانیەکانەوە نا تا لە قۆناغێکی مێژوودا کە تا ساڵی ١٦٤٠ درێژەی کێشا پیلانگێڕی تەرخان بکەن بۆ زاڵ بون بەسەر بانکی ئەوروپا...

# جەنگی خاچ پەرستەکان

**وێنە ڕاستەقینەکان و دەرەنجامەکان:**

کاریگەرییەکانی قۆرخکاری بازرگانی و ئاڵتون لە لایەن جولەکەکانەوە لە ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاست دەسەڵات دارانی سەر زەوی واتە جرمانییە ئارییەکانی تەنگەتاو کرد کە ئەو کات دوابەدوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی خاکی وڵاتە ئەوروپییەکانیان دابەش کردبو بەسەر خۆیاندا و بە زۆر دەستیان دایە زەوت کردنی سەروەت و سامانی وڵاتان هەر بۆیە ئەو کارەی جولەکەکان کە خێروبێریان لە ڕێگەی سووەوە دەبرد بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکان دادەنرێت بۆ پاڵ پێوە نانیان تا بەرەو خۆرهەڵاتی ئیسلامی گەشەسەندو هەنگاو بنێن و دواجار بن بە یەکێك لە هۆکارەکانی هەڵایسانی جەنگە خاچ پەرستەکان... بەتایبەت کاتێك کە کێبڕکێ لەسەر زەوت کردنی سەروەت و سامانی گەلانی ئەوروپا لە ڕێگەی زۆر و وەرگرتنی سوەوە تەنها دوای چەند ساڵێك لە کەوتنی ڕۆما بەدەستی جرمانییە بەربەرییەکان بوە هۆی ئەوەی کە هەژار بن و دوابکەون و شارستانیەتیان دوا بکەوێت.

ئەوە ئەم دۆخەی ئەوروپا بو کە ڕێگەی خۆشکرد بۆ ڕێککەوتنی هەندێك لە پادشا مەسیحیەکانی ئەوروپا لەگەڵ ئەو خاوەن زەوی وزار و نەجیب زادانەی کە بەدوای دەستکەوتدا دەگەڕان تا بە زۆر دەست بەسەر جیهاندا بگرن و هێرشێکی گەورەی خاچ پەرستی دەست پێ بکەن... لەم کاتەدا بەرژەوەندی ئەم کەسانە لەگەڵ بەرژەوەندی سو خۆرە جولەکەکان یەکی گرتەوە ئەوانەی کە پاڵپشتی پیرۆکەی ئەو هێرشەیان ئەکرد بە تەواوی توانایماڵیان و لە تەواوی ئەوروپادا بڵاو ببونەوە تا هانی ئەو خاوەن زەوی و زارانە بدەن تاخەزێنەکانیان

بۆیان بخەنە سەر پشت تا شەڕ کەر بەکرێ بگرن و بەرتیل بدەن بە هاوردەستەکانیان و بەم شێوەیەش ئەوان ئەو هێزە شاراوەیە بون کە لەپشت پەردەوە کاریان کرد لەسەر هەڵگیرساندنی شەڕی خاچ پەرستی... لەبەر ئەوەی لەم شەڕەدا ئەو هەلە زێڕینەیان بۆ هەڵکەوت تا قەرز بە بەهرەی زۆر بدەن بەخاوەن سەرکردەی هێزەکان، فەرمان ڕەواکان و دەسەڵاتدارەکانی کڵێسا سەرباری بازرگانی کردن بە چەك و چۆڵ و بونی ئامانجی سیاسی کە بریتی بو لە لاواز کردنی ئیسلام و مەسیحییەت لەیەك کاتدا...

یەکەمین هێرشی خاچ پەرستەکان لەساڵی ١٠٩٥ دا بو و ئەمەش بە سەرەتای هەشت جەنگە خاچ پەرستییەکە دادەنرێت کە بۆ ماوەی دو سەدە درێژەی کێشا لە نێوان ساڵەکانی ١٠٩٥ – ١٢٧١، ئەم شەڕانە مۆرکێکی ئاینی مەسیحیان بەخۆوە گرت و ڕای دەرخست بۆ ئەوروپیەکان کە ئەم هێرشانە ئامانج لێی پاراستنی ئەو کەسانەیە کە دەچنە زادگای مەسیح و گێڕانەوەی خاکی پیرۆزی مەسیحیەکانە (فەلەستین) بۆ باوەشی مەسیحیەکان... بەڵام لە ڕاستیدا، کاتێك کەلە وردە کاری ئەو شەڕانە ئەکۆڵینەوە بە ئاسانی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێتکەلە پشت ئەم هێرشانەوە بون، لەبەر ئەوەی ئەو هۆکارەی کە پاڵ بە هێزی خراپەکارەوە ئەنێت تا دوبارە چالاك ببێتەوە، کینە و هەڵپەیە بۆ سامانەکانی ئەوانی دی. هەندێك لەو هێرشانە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و هەندێکی دیکەشیان لەبەر بونی بەرگری موسوڵمانەکان شکستی هێنان بەڵام دەرەنجامی کۆتایی بریتی بو لە مانەوەی فەلەستین لە دەستی موسوڵمانەکان لە ساڵی ١٢٧١ .

هەندێك لە میرەکان لەوانەی کە بەشداریان کردبو لە جەڵانەوەی بەرەنگاربونەوەی هەژمونی جولەکەکان، کاریان ئەکرد تا ڕزگاریان بێت لە چنگی سوخۆرەکان، ئەم جوڵانەوەیە کە تا دەهات بازوی بەهێزتر دەبو و هەڵسان بەدەرکردنی یاسا گەلێك کە تایبەت بوبە گۆشەگیر کردنی جولەکەکان و ناچارکردنیان لە ژیان لە گەڕەکەکانی خۆیاندا و دواتر چەند یاسا گەلێکی دیکە دەرکرا کە لێیانی قەدەغە کرد کە مەسیحیەکان بەکار بهێنن بۆ کارکردن لە لایان بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان، ئەوەش کەلە پشت دەرکردنی ئەم بڕیارەوە بو

بریتی بو لەڕێگری کردن لە سوخۆرەکان کە لە ژێر بەرپرسیارێتی کارەکانی خۆیاندا دەرچن لەبەر ئەوەی جۆرێك لە گرێبەستە گوماناویەکانی خۆیان لە ڕێگەی ئەو مەسیحیانەوە ئەبەست کە دەکرانە نما بۆ خۆیان و دواتر تێوە ئەکلێنران لە کارەکانی خۆیان... هەروەها یاساکان قەدەغەیان کرد کە جولەکەکان ئافرەتی مەسیحی لە ماڵ یاخود کارەکانی خۆیاندا بەکار بهێنن بە ئامانجی پاراستنیان لە چاوچنۆکی سوخۆرەکان، لەبەر ئەوەی ئەوان لە خشتەیان ئەبردن بە شێوەی جۆراوجۆر و دواتر بەکاریان ئەهێنان بۆ ئامانجە تایبەتەکانی خۆیان و هیچ دەربەستیش نەبون لەوەی کە بازرگانی بە جەستەیانەوە بکەن لە پێناو پارە یاخود فریودانی دەرون بیمارەکان و بەستنی گرێبەستەکان، هەندێك یاساگەلی دیکەش دواتر ڕێگری کرد لە جولەکەکان تا هەستن بە چالاکی بازرگانی. بەم شێوەیە گەلانی ئەوروپا پێیان وابو کە ئیدی گرفتی جولەکە بەرەو پاکتاوبون ئەچێت و سوخۆرەکانیش بەرەو لەناو چون ئەچون، بەڵام ڕوداوەکان پێچەوانەی ئەوەیان دەرخست: ئەو یاسا کەلە توندە کە پشتیوان بو بە هێزی کڵێسا نەیتوانی سوخۆرەکان لەناو بەرێت یا لانی کەم وا لە سوخۆرەکان بکەیەنێت کە کارەکەیان بێهودەیە و پێویستە ڕێز لە ڕەوایەتی یاساکان وەربگرن، دەرەنجام ڕقی نورانیەکان زیادتر بو لە کڵێسای مەسیحی و سەرەتایەك دروست بو بۆ دژایەتی کردن و لاواز کردنی باوەڕی مەسیحی و لاواز کردنی دەسەڵاتی کڵێسا، سەرەتای ئەم کارە دواتر لە پلانێکی توندوتۆڵدا دەرکەوت کەپشتی بەستبویە دو بنەما:

بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی جیا کردنەوەی ئاین لە سیستەمەکانی دەسەڵات، بە مەرجێك ئەم هەڵمەتە لە بەر بڵاوترین ئاستدا و بەشێوەیەکی بەردەوام ئەنجامبدرێت بە بێ ئەوەی گوێ بەوە بدرێت کە چەندی تێ ئەچێت و چەند ماندو بونی پێویستە... لە لایەکی دیکەشەوە کاربکرێت لەسەر دروست کردن و پەرەپێدانی جیاوازی لە نێوان میر و کڵێسادا و ڕەوتەکانی بێ ئاکاریش پشتیوانی بکرێت و هان بدرێت لە لای هەموان.

# ڕاگواستنی گەورە

### چەند دیمەنێك لە مێژووی جولەکە:

پادشای فەڕەنسا هەوڵی دا لە ساڵی ١٢٥٣ بە شێوەیەکی ڕیشەییانە کێشەی جولەکە چارەسەر بکات لە ڕێگەی فەرمان دان بەدەرکردنیان لەبەر سەرپێچی کردن لە یاسا، بەو شێوەیە بە شێکی زۆریان ڕویان لە بەریتانیا کرد کە ئەو کاتە پەنای دان لەبەر ئەوەی سوخۆرە جولەکەکان لەو ماوەیەدا تا ساڵی ١٢٥٥ کۆنترۆڵی زۆرێك گەورە پیاوانی کڵێسا و خانەدان و خاوەن زەویو زارەکانی کردبولە ڕێگەی پێدانی قەرز بۆ پشتیوانی کردن لە جەنگە بەردەوامەکانیان[٢٤]، دواتر بەڵگەی تەواو بەدەست هات لەسەر پەیوەندی سوخۆرەکان و گەورەپیاوانی حاخام یاخود ئەوانەی کە پێیان ئەوترێت (داناکانی جولەکە) لەگەڵ نورانیەکان دا. دۆزینەوەی ئەو بەڵگەیە لەو لێکۆڵینەوانەدا دەرکەوت کە پادشا هنری بڕیاری دا ئەنجامبدرێت بۆ ڕیسوا کردنی پارە خواردن و بەرتیل و تاوانەکانی بازرگانی کردن بە جەستە و بەزۆر پارە وەرگرتن کە ئەڵبەتە ئەم کارانە دوای مردنی (هارون ئۆف لینکۆلن) دەرکەوت لە ساڵی ١٢٥٥ دوای ئەوەی کە لێکۆڵینەوەکان بە شێوەیەکی یەکلا

---

[٢٤]. کتێبی (هارون لینکولن) کە لە نوسینی هەردو جولەکە (شابی و فالنتاین)ە زۆر بە وردی باسی ئەم قۆناغەی مێژوومان بۆ ئەکەن لەو کتێبەدا بەم شێوەیە هاتوە (ژمارەی جولەکەکان زیادیان کرد و زیادتریش دەوڵەمەند بون و هارون ئۆف لینکۆڵنی جولەکە بو بە دەوڵەمەند ترین کەس لە بەریتانیا، مامەڵە داراییەکانی لە سەرجەم گۆشە و کەنارەکانی وڵاتدا ئەنجامئەدرا و زۆرێك لە پیاو ماقوڵان و خانە دانەکان و پاوانی کڵێسا تێوەی گلابون... بەڵام دەسەڵات دوای مردنی دەست گرت بە سەر سەروەت و سامانەکەی بۆیە لیژنەیەکی تایبەت دانرا بۆ بەڕێوەبردنی موڵك و ماڵەکانی.

کەرەوە دەریان خست کە هەژدە جولەکە ئەو کارانەیان کردووە و دواجار درانە دادگا و لە سێ داره دران.

شا هنری لە ساڵی ١٢٧٢ کۆچی دوایی کرد و شا ئدواردی یەکەم جێگەی گرتەوە کە ئەویش بە پێی خۆی بڕیارێکی دەرکر و تیایدا قەدەغەی کرد کە جولەکە کاری سوخۆی بکەن، دواتر لە ڕێگەی پەرلەمانەوە لە ساڵی ١٢٧٥ زنجیرە بڕیارێکی دەرکرد کە بە پێی ئەو بڕیارانە دۆخێکی تایبەتیان بۆ لەبەر چاو گیرا و بەو زنجیرە بڕیارە وترا (بڕیار گەلێکی تایبەت بە جولەکە) مەبەستیش لەم بڕیارانە کەم کردنەوە دەسەڵاتی سوخۆرەکان بو لە شارەکەیان بۆ پاراستنی مەسیحی و هەژارەکان پێکەوە، ڕەنگە ئەو زنجیرە بڕیارە بەیەکەمین زنجیرە بڕیارێك دابنرێت لە مێژووی پەرلەمانی ئینگلیزی دا کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبو لە دەرکردنی ئەو بڕیارانەدا و ناشکرێت بوترێت کە ئەو بڕیارانە دژ بە جولەکە بون لەبەر ئەوەی لەیەك کاتدا هەم جولەکە و هەم مەسیحیەیەکانی ئەپاراست[٣٥]، ئەم بڕیارە بە تایبەت هەژارەکانی ئەپاراست و جولەکە سوخۆرەکان ئەم جارەش پێیان وابو – وەك پێشتر کە چەند جارێك لە مێژوودا ڕوی داوە – ئەتوانن ڕویەڕوی بڕیاری شا ببنەوە هەروەك چۆن ڕوبەڕوی بڕیارەکانی کۆمەڵگە بونەتەوە بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی کە هەیان بوە بەسەر پیاوانی کڵێسا و دەوڵەت دا... بەڵام ئەمە گەورەترین هەڵەیان بو، لەبەر ئەوەی شا بڕیارێکی دیکەی دەرکرد ئەویش دەرکردنی تەواوی جولەکەکان بو لە بەریتانیا.. . بەم شێوەیە سوخۆرەکان دەرەنجامی کارەکانی خۆیان بینیەوە بەڵام بە بێ ئەوەی کە دەسەڵات و ئاڵتونەکانیان لێ وەربگیرێتەوە. بەم کارەش بەڵایان هێنا بەسەر ئەو جولەکە ئاساییانەی کە هیچ جۆرە گوناهێکیان ئەنجام نەداوە جگەلەوەی کە کەوتبونە دوای ئەم ژمارە کەمە... ئەمەش بە پێی وتەی هەندێك مێژونوس سەرەتای قۆناغێکە کە پێی دەوترێت (ڕاگواستنی گەورە) و

---

[٣٥]. (بڕیاربڕیارەکانی جولەکە) بە وردی لە کتێبی (جەنگێکی بێ ناونیشان) چاپکراوە لە نوسینی ئەفسەری بەریتانی (ئا.هـ.رامزی).

لەو کاتەوە ئەو گێژاوە گلۆڵەی جولەکەکانی خستە لێژی لە تەواوی ئەوروپا لەبەر ئەوەی سەرۆکەکان شوێن پێی شا ئدواردیان هەڵگرت، بۆنمونە لە ساڵی ١٣٦٠ واتە دوای ماوەیەکی کەم لە تەواو بونی شەڕی خاچ پەرستی و دەرکەوتنی دەرەنجامەکانی دوبارە فەرەنسا جولەکەکانی دەرکرد بەڵام ئەم جارە بە تەواوەتی، سەکسۆنیاش - یەکێك لە دەوڵەتە جرمانیەکان لە ساڵی ١٣٤٨ - هەمان کاری کرد دواتر هەنگاریا لە ساڵی ١٣٦٠ و بەلجیکا لە ساڵی ١٣٧٠ و سلۆفاکیا لە ساڵی ١٣٨٠ و نەمسا لە ساڵی ١٤٢٠ و هۆڵندا لە ساڵی ١٤٤٤ و دواجار ئیسپانیا لە ساڵی ١٤٩٢، ئەڵبەتە دەرکردنی جولەکەکان لە ئیسپانیا خاوەن گرنگییەکی تایبەتە لەبەر ئەوەی تیشك ئەخاتە سەر دادگاکانی پشکنین لە ئیسپانیا لەبەر ئەوەی زۆرێك لە دانیشتوانی وڵاتە ئەوروپیەکان پێیان وایە کە لەلایەن کڵێسای کاسۆلیکەوە دامەزراوە بە ئامانجی ئەشکەنجەدان و چەوساندنەوەی جیابوەکان لە کڵێسای ڕۆما و لەوانەش پرۆستنتانەکان. بەڵام لە ڕاستیدا ئامانج لێی کردنی بە ئامرازێك بۆ دۆزینەوەی ئەو بەشە لە جولەکەکان کە بە ڕوکەش خۆیان وەك مەسیحی دەرخستبو تا لە ژێر ئەو پەردەیەدا کار بکەن و لە ناوەوە ئامادەکاری بکەن بۆ کاری خۆیان، کڵێساش هەستی بە بونی پیلانێك کرد لەو جۆرە بۆ تێك شکاندنی پایەکانی ئاینی مەسیحی... لەچەند حاڵەتێك دا توانرا شوێنپێی هەڵبگیرێت و کەسە چەواشە کارەکان ئاشکرا بکرێت... دواتر توانرا دەقی وەڵامێك بدۆزرێتەوە کە حاخامی گەورە -ئەو کاتە لە ئاستانە پایتەختی ئیمپراتۆریتەی عوسمانی دادەنیشت- ناردبوی لە ژێر سایەی بەخشینی ئیسلامدا. ئەو حاخامە ناوی (خیمور) بو کە سەرۆکی جولەکەکانی تاراوگە بو لە شاری ئکس ئان بروفانسی فەرەنسی کە هەستابو بە وەڵام دانەوەی ڕاوێژێك کە پێی کرابو دوای ئەوەی کە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا جولەکەکانیان دەرکردبو.. ئەو نامەیەی کە حاخامی گەورە واژۆی لەسەر کردبو بەناوی (میری جولەکە) بە بەرواری ١٣ کانونی دووەم ١٤٨٦ نێردرابو، ڕێنماییەکانی ئامۆژگاری ڕاوێژکارەکانی ئەکات کە پەیڕەوی لە ئەسپی تەڕوادەی بەناوبانگ بکەن کە توانیان لە پشتەوە بچنە ناو

قەڵای دوژمنەکانیانەوە هەروەك چۆن جەنگاوەرە یۆنانیە کۆنەکان توانیان بچنە ناو شاری تەرواده‌ی گەمارۆدراوەوە دوای ئەوەی کە خۆیان لە ناو ئەسپێکی دارینی گەورەدا شاردبۆوە... بە واتایەکی ڕونتر منداڵی جولەکەکانی کردە قەشە و مەسیحی و مامۆستاو دادوەر و پزیشك و هتد... تا لەناوەوە بتوانن مەسیحیەت تێك بشکێنن[٣٦]... ئەڵبەتە دادگاکانی پشکنین تەنها بەئەرکی سەرەکی خۆی پەسەندەی نەکرد کەلە پێناویدا دامەزرابو بەڵکو بوە ئامرازێکی سەرکوتکردن کە هەموانی گرتەوە بە بێجیاوازی، ئەوەش ڕاست نییە کە لە بارەیانەوە بڵاو کرایەوە لەلای ئەورووپیەکان کە ئامانجیاندروست کردنی هاوسۆزیەو هەستی پەشیمان بونەوە بو، بەڵکو ئەمە بریتی بو لە دەزگایەکی تایبەت بۆ چەوساندنەوەی جولەکەکان... کاتێکیش کە پشکنەری گەورە (توركوما‌دا ١٤٢٠-١٤٩٨) بڕیاری لەسەر مەراسیمە سامناکەکانی سوتاندن دا، هەر کەسێکە کە تۆمەتی جادو و ناپاکی و دژە ئاینی بەسەردا بسەپایە جا جولەکە بوایە یاخود نا دەست بەجێ ئەگیرا و ئەسوتێنرا... بەم شێوەیە ئەو بەڵایەی کە بەسەر جولەکەکانی ئیسپانیادا هات هۆکاری ئاینی نەبو بەڵکو کاردانەوەیەك بو بەرامبەر هەڵسوکەوتیان لە بوارگەلی ئابوری و کۆمەڵایەتی دا.

ئەوە ڕاستیە وردەکانە کە تیشك ئەخاتە سەر ئەو ڕوداوە مێژووییە کە هۆکارەکانی هەندێك جار نادیارە. لە سەدەی چواردەهەم جولەکە سو خۆرەکان بۆ یەکەمین جار توانیان کە حکومەتی ئیسپانی ناچار بکەن کە ماف وەرگرتنی باجیان هەبێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ وەك گرەنتییەك بۆ ئەو قەرزانەی کە ئەیاندا بە حکومەت ئەمەش خەڵکی خستە ژێر ڕەحمەتی ئەوانەوە... ئەوانیش بە خراپترین شێوە ئەو دەرفەتەیان قواستەوە و زۆر دڕندانە داوای (پارچە

---

([٣٦]) ئاسانە بەراوردی ئەو لێکچوتە سەیرە بکرێت لەنێوان ئەم ڕەوشە و پیلانگێڕی(دونما) دا کە گروپێکی شاراوە بون لە جولەکەی (سالۆنیك) لە ئستەنبوڵ کە بە ڕوکەش بون بە ئیسلام بە ئامانجی تێك دانی لە ناوەوە لە ڕێگەی بڵاو کردنەوەی شتی بێ بنەما و دور لە ڕاستی و ڕوبەڕو بونەوەی هەر جوڵانەوەیەکی چاکسازی ئیسلامی کە ئامانج لێی سەرخستنی ئیسلام بێت.

ڕۆلی بەردەکانی سەر تەختەی شەترەنج بگێڕن... بەکورتیەکەی ئەبنە ئەو بوکەڵەیەی کە لە پشت پەردەوە شارەزا بەتواناکانی ئێمە ئەیجولێنێت). دواتر چوە سەر باسی شیکردنەوەی ئەو مەرجانەی کەدەبێت لەکەسە شارەزاکاندا هەبێت و وتی: (ئەو شارەزا و پسپۆڕانە هەر لە منداڵیەوە هەڵ ئەبژێردرێن وسەرپەرشتی فێرکردن و ڕاهێنانیان ئەکرێت تا ئەگەنە ئاستی ئەو بلیمەتییەی کە ئەیانگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە بە شێوەیەکی نهێنی دەست بگرن بەسەر جیهاندا... ).

١٣. کەسە کۆبوەکان لەم خاڵەدا باسیان لە پرسی پڕوپاگەندە کرد و ڕۆتشیڵد هۆشداری پێدان لەسەر پێویستی کۆنتڕۆڵ کردنی تەواوەتی دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ئەو کۆنتڕۆڵەی کە ئەرکی پاراستنی سامان و پلانەکانیان ئەگرێتە ئەستۆ لە کاتێکدا لەوان خۆیان لە پشت پەردەوە ئەشارنەوە و بەدور ئەبن لە گومان ئەو درۆ و دەلەسانەی کە بلاوی ئەکەنەوە لەناو خەڵکدا. ڕۆتشیڵد وتی:(لە ڕێگەی دەست گرتنمان بەسەر ڕاگەیاندندا، چەکێکی ئاڵتونی بەدەست ئەهێنین و هیچ گرنگ نیە کە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە دەریایەك لە خوێن و فرمێسکی قوربانیەکان بڕێژین.. هەندێك جار قوربانیمان بە خۆمان داوە لە پێناو بەدەست هێنانی ئەو چەکە بەلام پێویستە ئەوە لە یاد ئەکەین کە سودەکەی وای کردوە کە هەمیشە یا لە سودی ئێمە هەڵ بکات... هەروەها پێویستە ئەوە لە یاد ئەکەین کە هەر قوربانییەك لە ئێمە بەرامبەرە بە هەزار کەس لە جوییمەکان.. ".

١٤. دواتر ڕۆتشیڵد چوە سەر باسی ئەو ڕێکخراوانەی کە سەر بە پیلان گێڕییەکەن، ڕونی کردەوە کە پێویستە ئەو ڕێکخراوە بە شێوەیەکی ئاشکرا دەربکەوێت دوای ئەوەی کە دۆخی گەل ئەگاتە ئاستێك لە هەرەس هێنان و دوای ئەوەی کە جەماوەر مل کەچی ئامرازەکانی تیرۆر و هەڵخەڵەتاندن و ترس ئەبێت... کاتێکیش کە پلان داڕێژەکان ئەبینن کە کاتی ئەوە هاتوە بۆ دوبارە گێڕانەوەی حوکمڕانی، بۆچونێك بلاو ئەکرێتەوە لەسەر ئەوەی کە بەرپرسیارانی ڕوداوەکان کەسانێکی تاوانبر و سەرچڵ بون. لە درێژەی

قسەکانیدا دەڵێت: دوای ئەوەی کە هەندێك لە تاوانبار و کەسانی سادە تاوانبار ئەکەین بە بونی دەستیان لە تیرۆردا، هەڵ ئەستین بە لە سێ دارەدانیان لە کاتی خۆیدا و بەم شێوەیە لە چاو جەماوەردا ئێمە وەك ڕزگار کەریان دەر ئەکەوین. هەوەرها ڕۆتشیلد دەلێت: " ئەمە هاوکات ئەبێت لە گەڵ ئامانجی پێچەوانەی ئێمە کە بریتیە لە دەسەلاتی تەواوەتی و تۆڵە سەندنەوە لە جوییم".

١٥. دواتر ڕۆتشیلد چوە سەر خاڵێکی دیکە و تیایدا پەردەی لەسەر "داڕمانی ئابوری و قەیرانەکانی ترس هەڵماڵی" و ڕونی کردەوە کە چۆن دروست ئەکرێت و ئەجولێنرێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە:"قەیرانی گشتی بێ کاری لە دەرەنجامی وەستانی کار و قەیرانی برسێتی ئەبونی خۆراك بە پێی ئەو دەسەلاتەی کە هەمانە دروست ئەکەین، ئەمەش دەبێتە هۆی لەدایك بونی مافێکی نوێ کەئەویش مافی سەرمایەیە لە هەژموندا. بەردەوام بو لەسەر ڕون کردنەوە و وتی کە چۆن ئەو ڕێکخراوە جەماوەر بە ڕێوە ئەبات و زاڵ ئەبێت بەسەریدا و چۆن هەرکەسێك ناهێڵرێت گەر بیەوێت لەبەردەم ئەو ڕێکخراوە بوەستێت یاخود بیەوێت جەمارەر بجولێنێت لە دژی ڕێکخراوەکە.

١٦. خاڵی دواتر بریتی بو لە دزەکردنە ناو دڵی ماسۆنیەتی ئەوروپی، قسەکەر باسی لەوە کرد کە ئامانج لەو کارە سود وەرگتنە لە توانای چونە ناوەوە و نهێنی کاری ماسۆنیەت و ئاماژەی بەوە دا کە کۆمەڵەی پیلانگێڕی ئەتوانن کۆڕی ڕۆژهەلاتی گەورە کە پێی دەوترێت (ماسۆنیەتی شین) ڕێك بخەن کە سەر بە خۆیانە و ئەرکی ئەوەی پی بسپێرن کە چالاکییەکە لە ژێر ناوی کار خێرخوازانە و مرۆڤ دۆستانە ڕێك بخەن، ئەو کارانەی کە لە ڕێکەیەوە ماسۆنیەت ئەچێنرێت. هەروەها ئامارەی بەوە دا کە ئەو ئەندامانەی کە کۆڕەکانی ماسۆنیەت لەخۆێ ئەگرێت دوای مەشق و ڕاهێنان ئەرکی بلاوکردنەوەی بیروبۆچونی مادیگەرا و بێ باوەڕیان پێ ئەسپێردرێت لەنێو ڕیزەکانی جوییم دا واتە لە نێو تەواوی مرۆڤایەتی دا بەبێ جولەکەکان.

١٧. دواتر ڕۆتشیلد هاتە سەر خاڵی سەرەکی لە پەیڕەوی پیلانگێڕییەکە کە بریتیە لە (بایەخی زۆر نائومێد بونی گەلان بە شێوەیەکی بەردەوام و بەرنامە بۆ داڕێژراو).. هەوەرها ئاماژەی بەوە دا کە ئەم ئەرکە ئەبێت ئەو ڕێك خراوە لە ئەستۆی بگرێت کە ڕانەهێنرێت لەسەر ڕستەی پڕ باق و بریق و ئەو دروشمانەی کە سەرنجی جەماوەر ڕائەکێشێت، هەروها ئەم تێبینیە زیاد ئەکات و ئەڵێت: (ئەکرێت هەمیشە بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنانە کار بکرێت کە ئەدرێت بە جەماوەر... کەوتە ئەم بەڵێنانە شتێکی گرنگ نیە... ) دواتر ناوەڕۆکی بیرۆکەکەی ڕون کردەوە و وتی:(ئێمە جەماوەر ئەجولێنین و هەستی خرۆشانی ئەگەیەنینە ئەو پەڕی لە ڕێگەی بەکار هێنانی وشەگەلێکی سەرنج ڕاکێشی وەك ئازادی و ڕزگاری خوازی و تا کۆتایی... ئەوکاتە ئەکرێت جەماوەری جوییەمەکان ئاڕاستە بکرێت بۆ تێك شکاندن و لەناو بردنی هەر شتێك تەنانەت یاسا سروشتی و ئاسمانیەکانیش... کاتێکیش کە دەسەڵات ئەگاتە کۆتایی ئەو کاتە ئاسان ئەبێت بۆ ئێمە کە ناوی خوا و یاسا ئاسمانیەکان لە سروشت بسڕینەوە...).

١٨. دواتر نۆرە هاتە سەر ڕۆڵی یاخی بونی چەکدارانە و بایەخی هونەری شەڕی کۆڵان بە کۆڵان، ڕۆتشیلد لێرەدا ئاماژە بەوەدا کە دەسەڵاتی تیرۆر بەکار بهێنرێت لەبەر ئەوەی باشترین ڕێگەیە و کەمی تێ ئەچێت بە شێوەیەك کە ناکرێت دەست بەرداری بین دوای هەر یاخی بونێك بۆ ئەوەی ترس و تۆقاندن بڵاو بکەینەوە لەناو جەماوە و تا دواجار بە شێوەیەکی خێرا ملکەچ بکرێت.

١٩. دواتر باس هاتە سەر دیبلۆماسیەت، ئەندامانی کۆبۆوە پێك هاتن لەسەر ئەوەی کە لە دوای هەر شەڕێك پێویستە کاری دیبلۆماسی نهێنی ئەنجام بدرێت. هۆکاری ئەوەش بە پێی بۆچونی ڕۆتشیلد ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە: (ڕێکخراو هەڵ ئەستێت بە دانانی شارەزاکانی لە نێوەندە هەستیارەکانی ئابوری، سیاسی و دارایی لە شێوەی ڕاوێژکار لە سەر هەردو ئاستی دەرەوە و ناوەوە بە شێوەیەك کە ئەو ئەرکانەی کە بە شێوەیەکی نهێنی لە لایەن دەسەڵاتی نهێنی یەوە پێیان ئەسپێردرێت لە پشت پەردەوە، ئەنجامی ئەدەن بە

بێ ئەوەی ترسی لە ئاشکرا بون هەبێت". دواتر ئەم هۆشارییەی دا بە ئامادەبوان: "پێویستە دیپلۆماسیەتە شاراوەکەمان بگاتە ئاستێك لە دەسەڵات کە ئیدی هیچ نەتەوەیەك نەتوانێت ببێ ئێمە هیچ جۆرە گرێبەست یاخود ڕێك کەوتن نامەیەك ئەنجام بدات.".

٢٠. دواتر ڕۆتشیڵد باسی لە ئامانجی کۆتایی کرد: دەست گرتن بەسەر تەواوی جیهان،ڕێگەش بۆ گەیشتن بەو ئامانجە: (پێویست ئەبێت کە زنجیرەیەك قۆرخکاری جهانی ئەنجام بدرێت بە پشتیوانی دارایی ئێمە بە شێوەیەك کە بگاتە ئاستێك لە دەسەڵات و هەژمون کە ئیدی هیچ سامانێکی نیشتیمانی جوییم نەتوانێت لە ژێر چنگی ئەو قۆرخکارییە دەربچێت . کاتێکیش کە سەرە دێتە سەر لێدانی یەکلا کەرەوەی ئابوری نەتەوەیەك، ئەو کاتە ئەو نەتەوەیە لە ڕوی ئابوری و سیاسیەوە ئەکەوێت و لەگەڵیشیدا تەواوی سامانە نیشتیمانیەکان ئەکەوێت... ". لە درێژەی قسەکانی لەگەڵ کۆبوەکان ئەڵێت: "تەواوی ئامادە بوان پسپۆڕن لە بواری ئابوری ئەمەش بە مانای ئەوە دێت کە ئێمە هەمومان درك بەو دەرەنجامانە ئەکەین کە لەم پرۆسەیەوە ئەکەوێتەوە... ".

٢١. دواتر باسەکە گۆڕا بۆسەر شەڕی ئابوری و لێرەدا باسی ئەو پرۆژانەی وروژاند کە ئامانج لێی دەست گرتنە بە سەر خاکی جوییم و لێسەندنەوەی مافی خاوەندارێتی زەوی کشتوکاڵی و موڵك و پیشەسازییە. ئامادە بوان پێك هاتن لەسەر گرتنە بەری ئەم پلانانەی لای خوارەوە:

سەپاندنی باجی زۆر لە ڕێگەی ڕێکخراو و دروست کردنی دۆخ گەلێك کە تیایدا ستەم بێتە ئاراوە لە کێبڕکێی ئابوری ناوخۆدا تا دەرەنجام ببێتە هۆی ڕمانی ژیانی ئابوری لەلای جوییم و سود وەرگرتن لە سەرمایە گوزرای و بەرژەوەندییە داراییەکانیان. لە بواری نێو دەوڵەتیشدا "پیلانگێڕی" وردە وردە دەست ئەنێتە بینەقاقای میللەتی دیاری کرا و تا خۆی خۆی دەربکات لە بازاڕە جیهانیەکان... ئەو کارەش لە ڕێگەی کۆنترۆڵکردنی بازاڕەکانی کەرەستەی خاوەوە دێت، ئەو بازاڕەی کە ئەو میللەتە مامەڵەی پێوە ئەکات دواتر ئائارامی

لە ناوخۆدا دروست ئەکرێت لە نێو کرێکارەکاندا و پاڵ پێوە ئەنرێن تا دەست لە کار هەڵبگرن و داوای موچەی زۆر بکەن و لە هەمان کاتدا لایەنە ڕکابەرەکان بە پارە ئەکڕدرێن... دواتر ڕۆتشیڵد ئەم هۆشدارییەی دا: (پێویستە بە شێوەیەك کار بکەین کە کرێکارەکان بە هیچ شێوەیەك نەتوانن سود لەو کرێ زیادەیە وەربگرن کە دەستیان ئەکەوێت).

٢٢. دواتر باس هاتە سەر چەك. ئەندامانی کۆنگرە پێشنیارێکیان قبوڵ کرد کە ئەڵێت پێویستە کوشتارگە لە نێوان نەتەوەکانی جوییم دروست بکرێت و تیایدا ترسناکترین چەك بەکار بهێنرێت تا ئەو کاتە دێتە پێشەوە کە نیدی ئەو میللەتە شەکەت ئەبێت و تەنها هەژار و زەحمەت کێشی تێدا دەمێنێت، ئەو کەسانەی کە لە لایەن پیلانگێڕەکانەوە سەرمایە گوزاریان لەسەر ئەکرێت.

٢٣. سیستەمی نوێ دوای سەرکەوتنی پیلانگێڕییەکە: حکومەتێکی جیهانی دروست دەبێت دوای ئەوەی کە کۆمەڵەی پیلانگێڕی هەڵی دەبژێرێت.

٢٤. بایەخی گەنج: پیلانگێڕان بەم شێوەیە زاڵ ئەبن بەسەر گەنجدا: پێویستە کە ڕێکخراو بخزێتە ناو تەواوی چین و نێوەندە کۆمەڵایەتی و حکومیەکان و کار بکات لەسەر فریودانی گەنج لە هەمو شوێنێك بە ئامانجی خراپ کردنی لە ڕێگەی گشتاندنی بەرەڵایی و بیرۆکەی خراپ و شێواندنی بیرکردنەوە و ڕوبەڕو بونەوەی ئایینە ئاسمانییەکان...

٢٥. دواجار سەرە هاتە سەر ڕۆڵی یاسا: پێویستە دەست نەبرێت بۆ یاسا ناوخۆیی و دەرەکیەکان بەڵکو دەبێت وازی لێ بهێنرێت بەڵام خراپ بەکار بهێنرێت تا دواجار ئەبێتە وێرانکردنی شارستانیەتی جوییم. ئەوەش دەبێت بەم شێوەیە بێت: (یاسا پیادە ئەکرێت و بەردەوام بە شێوی دژ بەیەك لێك ئەدرێتەوە بە شێوەیەك کە سەرەتا ڕۆحی یاسا پەردە پۆش ئەکرێت و دواتر دەسەڵاتی یاسا بە شێوەیەکی پراکتیکی نامێنێت ئامانجیش لەو کارە: پیادە کردنی یاسای زۆرە ملێیانە لە جێگەی دەسەڵاتی یاسا و ڕۆحی فەرمانە ئاسمانیەکان). هەروەها ڕۆتشیڵد ئەم تێبینیەی خوارەوەی زیادە کرد: ڕەنگە پێتان وابێت کە جوییم دوای ئەوە بێ دەنگ نابن و پەلاماری ئێمە ئەدەن بەڵام

ئەمە هەڵەیە... لەو وڵاتانەی کە تیایدا سیستەمی یاسایی و ئاین و ئاکارمان لەناو بردوە... ڕێکخراو گەلێك ئامادە ئەکرێن بۆ هەر پێش هاتێك، ئەو ڕێك خراوە بە ئەندازەیەك بەهێز و سامناك ئەبێت کە تەواوی هێزەکانی دیکە لێی دەترسن. لقە نهێنیەکانی ئەم ڕێك خراوە لەهەمو شوێنێك دا بڵاو ئەبێتەوە... هەوڵ ئەدەین کە ڕێکخراوگەلێکی دیکەی هاوشێوە دروست بکەین لەگشت پایتەخت و شارێك تا گومانی ئەوەی لێ بکرێت کە ئەو مەترسیە لە وێوە سەرچاوەی گرتوە...

ئەو بەڵگانەی کەلەبەر دەستی من دایە لەسەر ئەو کۆبونەوەیە لێرەدا کۆتایی پێ دێت، شایانی باسە کە ئەو کۆبونەوەیە لە نیوەندی دامەزراوەی ڕۆتشیلد ئەنجامدراوە لە شەقامی (بوندن شتراس) لە فرانکفۆرتی ئەڵمانیا.

لێرە ئەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە ئەو بەڵگە نامە ترسناکانەی کە لە ساڵی ١٩٠١ کەوتە دەست پرۆفیسۆر نیلوسی ڕوسی لە کتێبی (مەترسە جولەکە) دا بڵاوی کردەوە کەلە ساڵی ١٩٠٥ دا لەچاپ درا، ئەو کتێبە بەڵگەنامەی دەگمەن لە خۆ ئەگرێت لەسەر پیلانگێڕییە سەرەکیەکە. لە بەراورد کردنی بە شی یەکەمی بەڵگە نامەکانی پرۆفیسۆر نیلۆس لەگەڵ بەڵگە نامەکانی من دەر دەکەوێت کە هاوشێوەی یەکن. بەڵام دواتر زانیاری زیادتر لە خۆ ئەگرێت کە باس لە بەکار هێنانی تیۆریەکانی داروینزم و مارکسیزم ئەکات لە لایەن پیلان گێڕانەوە.

جێگەی ئاماژە پێدانە کە گرنگترین زانیاری بەڵگە نامەکانی پرۆفیسۆر نیلۆس ئەو زانیارییانە بون کە لە بارەی چەك و ماسکی نوێی پیلانگێڕانەوە بو و بریتی بو لە (زایۆنیزم)[49]، پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین کە زایۆنیزم ئەو کاتە

---

([49]) لە ساڵی ١٩٠٥ کەم کەس بە کتێبی مەترسی جولەکەی زانی کە تیایدا هۆشداری درا بە جیهان لەسەر مەترسی جوڵانەوەیەکی نوێ: "زایۆنیزم" زۆر کەسیش گاڵتەی بەوە دەهات کە لە کتێبەکە هاتبو کاتێك باسی لەوە ئەکرد کە: ئەم جوڵانەوەیە ئەبێتە سەرچاوەی کارەسات بۆ مرۆڤایەتی و زاڵ ئەبێت بە سەر وڵات گەلێکی زۆردا و ڕێکخراو گەلێکی تیرۆریستی زۆری لێ بەرهەم دێت.

لە سەرەتای لە دایک بونیدا بو لەبەر ئەوەی تەنها ماوەیەک بەر لەوە واتە ساڵی ١٨٩٧ ڕێکخستنەکەی کۆتایی پێهاتبو.

کەس ئاماژەی بە هوشدارییەکەی پرۆفیسۆر نیلوس نەدا تەنها دوای تێپەڕ بونی ماوەیەکی زۆر نەبێت کاتێک کە لە ئینگلتەرا پەردە لەسەر ئەو پیلانە شاراوەیە لادرا کە بوە هۆی ڕوخاندنی شا ئیدوردی هەشتەم و ناچاری کرد کە دەست بەرداری دەسەلات بێت. هەر ئەو کتێبە ساڵی ١٩٢١ لە لایەن (ڤکتۆر ماردس)ەوە وەرگێردرایە سەر زمانی ئینگلیزی کە ئەو ناونیشانێکی نوێی بۆ هەڵبژارد کردی بە (گرێ بەستەکانی حوکمڕانە زایۆنیەکان)(*).

ئەو بەڵگانەی کەلە بەر دەستی من دایە تەنها لە دوشت دا جیاوازە لە بەڵگەکانی پرۆفیسۆر نیلوس و گرێبەستەکانی حوکمڕانە زایۆنیەکان: ئەو زانیارییە زیادانەی کە بەڵگە نامە نوێکان لە خۆی گرتبو کەدەرەنجامی گۆڕانکارییە نوێکانی پیلانگێرییەکە بو جگە لەو ناونیشانەی کە ڤیکتۆر ماردس هەڵی بژاردبو.. ئەڵبەتە ئەم ناونیشانە ئەمان گەیەنێتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو گرێ بەستە لە لایەن ئەندامانی کۆبونەکەوە دانرابێت لە کاتێک دا کەل لە لایەن حوکمڕانە زایۆنیەکانی هاوشێوەی ئامشیل مایەر ڕۆتشیلدەوە پێش کەشیان کرابو.. بەلام ئەنجامانی کۆبونەوەکە ئەوانەی کە لەسەر گرێبەستەکە پێک هاتن و پلانی کاریان داڕشت کەس نەبون جگە لە کۆمەڵێک سوخۆری جیهانی و خاوەن ئاڵتون و پیشەسازی کە بە ڕێنوێنی قەشەخراپەکارەکان، کار ئەکەن.

---

(*) ئەم کتێبە لەسەرتاسەری جیهاندا ناوبانگی پەیدا کرد و بە شێوەیەکی دروست یاخود نادروست وەرگێردرایە سەر زمان گەلێکی جیاواز.

## جێبەجێکردنی پلانی شۆڕی فەڕەنسی

قۆناغەکانی ئەم پلانە بە پێی ئەوە ئەبێت کە لە ڕێک کەوتنەکەدا هاتوە بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١. بە پێی ئەوەی کە دیاری کراوە گیانی یاخی بون بەسەر دەسەڵاتی یاسایی ئەو کاتەی فەڕەنسا بڵاو ئەکرێتەوە لە ناو جەماوەردا. لەناو بردنی دەسەڵاتەکەش لە ژێر سایەی دەسەڵاتێکی تیرۆرەوە ئەبێت کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشراوە لە لایەن نورانیەکانەوە.

٢. نورانیەکان فەرمان ئەدەن بەو ڕێکخراوانەی کە سەر بەخۆیانن لە فەڕەنسا تا بخزێنە ناو دڵی ماسۆنیەتی فەڕەنسی تازە دامەزراو تا ئەو کاتەی کۆڕی ڕۆژهەڵاتی گەورە دروست ئەکەن بە شێوەیەك کە تۆڕە نهێنیەکانی بەکار ئەهێنن لە گشت شوێنێك وەك ئامرازێك بۆ کارکردن لەسەر بڵاو کردنەوەی گیانی یاخی بون و بیری مادیگەرا و بێ باوەڕی.

ڕۆتشیڵد قسەکانی لەو کۆبونەوەکەدا کۆتای پێهێنا بە جەخت کردنەوە لەسەر گرتنە بەری ڕێو شوێنی توند لە پەیوەندی پیلان گێران بە شۆڕشەوە تا ئەو پەیوەندییە بۆ هەتا هەتایە بەنهێنی بمێنێتەوە.

### بەڵگەکان:

بێ گومان ئەم دو پرسیارە دروست دەبن لەناو مێشکی خوێنەردا:

١. چ بەڵگەیەك هەیە لەسەر بەستنی ئەو کۆنگرەیە و کۆنگرەکانی دیکەی هاوشێوەی؟

٢. ئەگەر کۆنگرەیەکی لەو چەشنە بەسترابێت، چۆن توانرا بزانرێت کە چی تیا گوزەراوە؟ چ بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەو لێکۆڵینەوانەی کە باسیان لێوە کرا؟

وەڵام ئەم پرسیارانە زۆر ئاسانە، ئەشبێت دان بەوەدا بنێین کە هۆکارەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ، یەکەم خواستی خوا.. لە ساڵی ١٧٨٥ هەورە بروسکەیەك دای لە سوار چاکێك لەسەر ڕێگەی فرانکفۆرت – پارسی لە ئەڵمانیا کە بە خێرایی بەسەر ئەسپەکەیەوە لەسەر ئەو ڕێگەیە ئەڕۆیشت، دواتر دەرکەوت کە ئەو سوارچاکە پەیام بەرێك بوە کە لەگەڵ خۆیدا بەڵگە نامەی پێبوە لەسەر پیلانگێڕی جیهانی بە شێوەیەکی گشتی و کۆمەلێك ڕێنوێنی لەسەر شۆڕی فەڕەنسا بە شێوەیەکی تایبەتی کەلە لایەن نورانیە جولەکەکانی ئەڵمانیاوە نێردراوە بۆ مامۆستای مەزنی[٥١] کۆڕگەلەکانی ڕۆژهەلاتی گەورەی ماسۆنیەکان لە فەڕەنسا کە ناوی دۆك دورلیانی بەناوبانگ بو، دەست گرتنی نورانیەکان بەسەر ماسۆنیەتی فەڕنسا بە پێی پلانی ناوبراوەوە بو و بەو پێیەش کۆڕە ماسۆنیەکان لە ژێر سەرپەرشتی دۆك دورلیان بوە، تۆڕگەلێکی نهێنی ئامادە کاری بۆ تەقاندنەوەی شۆڕ ئەکرد...

دوای تەواو بونی قۆناغی پێشەکی کە تیایدا دۆك دورلیان پەیوەندی کرد بە نورانیەکانەوە لە ڕێگەی میرابۆی بەناوبانگ، ئەو کەسەی کە نورانیەکان هەڵیان بژارد تا ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت، پەیامبەری پیلان گێڕییەکە لە ناوچەی (راتسیون)ی سەر بە دادگای باڤاریا لەناوچو هەروەك چون کە باسمان لێوەکرد، بەو شێوەیە ئەو بەڵگەنامانە کەوتنە دەست حکومەتی باڤاریا هەروەك لە سەرەتای پێشەکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێدا... هەروەها خۆشم بە شێوەیەك لە شێوەکان ئاماژەم بەوە داوە کە من ئەم زانیارییانەم لەو بەڵگە نامانە بەدەست هێناوە.

---

([٥١]) ئەمە ئەو ناز ناوەیە کە ماسۆنیەکان لە سەرۆکی گەورەی کۆڕە ماسۆنیەکانی ئەنێن.

## نورانیەکان

سەرانی نەخشە بۆ دانەری جوڵانەوەی جولەکەی جیهانی

هەروەك زانراوە حاخامە جولەکەکان دەسەڵاتی پەها دەبەخشنە خۆیان لە شرۆڤەکردنی ئەوەی کە پێی دەڵێن مانای شاراوەی کتێبە پیرۆزەکان ئەویش لە ڕێگەی سروشێکی تایبەتەوە، ئەم بۆچونە لە خودی خۆیدا خاوەن بایەخێکی ئەو تۆی نیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حاڵەتە ئەگۆڕێت کاتێك کە ڕێکخراوێکی تایبەت دروست بکرێت کە مل کەچی حاخامەکان بێت و کار بکات لەسەر ئەوەی کە خواستەکەیان پیادە بکات، ئەو خواستەی کە دەڵێن ئەوە سروشێکی خواوەندە، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە حاخامەکانی کڵێسای جولەکە و سەرانی جولەکەی جیهانی کۆبونەوە و بڕیاری ئەوەیان دا کە کۆمەڵەیەکی نهێنی پێك بهێنن کە کار بکات لەسەر جێبەجێ کردنی مەبەستەکەیان کە پێی دەوترا "کۆڕی نورانی"، خودی وشەی نورانیش لە ئەفسانەکانی جولەکەوە وەرگیراوە و بە شێوەیەکی وورد تر لە وشەی "لوسفەر"ەوە هاتوە کەناوی ئەهریمەنە لە ئینجیلە لاتینیەکان و بەمانای (هەڵگری ڕوناکی دێت).

کەواتە وشەی نورانی بەو کەسە دەوترێت کە ڕوناکی وەر ئەگرێت یاخود بە مانایەکی دیکە بەو کەسە دەوترێت کە سروشی بۆ دێتە خوارەوە . ئەندامەکانی بە سیانزە ئەندام دیاری کراوە کە کڵێسای جولەکە پێی وایەکە ئەوە شاندی جێبەجێ کاری ئەنجومەنی باڵایە: ئەنجومەنی سی و سێ. بەڵام ئەم ئەنجومەنەی دوایی بێدەنگییەکی زۆری لەبارەوە کراوە و شاراوەیە.

دیاری کردنی ئەندامانی ئەنجومەنی جولەکە بە ١٣ئەندام هەر لە خۆیەوە نەهاتوە بەڵکو خاوەن ئاماژەیەکی قوڵە: ئەو ئەنجومەنە ئەو ژمارەیەی هەڵبژاردوە تا هەمیشە و بەردەوام ئەندامەکانی ئەوەیان لە یاد بێت کە ئامانجی یەکەمینیان نەهێشتنی ئاینی مەسیحیەتە... ئەو ئاینەی کە مەسیح و دوانزە کەسە نزیکەکەی هێناویانەتە بون... هۆکارێکی دیکە هەیە کە بایەخی کەمتر نیە لە هۆکاری یەکەم ئەویش سیانزە نەوەکەی ئیسرائیلە... ڕەنگە ئامانج ئەوە بێت کە نوێنەرایەتی تەواوی نەوەکان بکرێت لە کۆڕی نورانیەکاندا.

نورانیەکان مەراسیم گەلێکی تایبەتیان ئەنجام ئەدا بە مەبەستی نهێنی پارێزی و نەهێشتنی هەر ئەگەرێکی ئەنجام دانی ناپاکی لە جۆری ئەو ناپاکییەی کە یەهوزا بەرامبەر بە مەسیحیەت کرد. لە مەراسیە تایبەتانەدا هەر کەسێك کە پەیوەست ئەبێت بە نورانیەکانەوە ئەبێت ملکەچی تەواوەتی سەرۆك و ئەنجومەنە سی و سێ کەسیەکە بێت و دان بنێت بە دەسەڵاتە بەرزەکەی بەوەی هیچ دەسەڵاتێکی دیکە بە بەرزتر لەسەر زەوی دانەنێت.

لێرەدا ئەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە یاسای نورانی بۆمان ڕون ئەکاتەوە کە بۆچی کۆمۆنیستەکان لە هەر وڵاتێکدا هیچ دڵسۆزییەکیان نیە بۆ نەتەوەکەیان بەڵکو ئەوان تەنها دڵسۆزن بەرامبەر بە دەسەڵاتی باڵای کۆمۆنیزم ئەو دەسەڵاتەی کە ئاڕاستەی جوڵانەوەی کۆمۆنیزم ئەکات.

## شۆڕی فەرەنسا: دەست بەکار بون

**قۆناغی پەیمانی شاراوە:**

نورانیەکان بڕیاری ئەوەیان دا کە کۆڕی ڕۆژهەلاتی مەزن لە شاری ئەنگولدشتات دابنێن و بیکەنە نێوەندی خۆیان بۆ دەست پێکردنی هەڵمەتی خزینی ڕێکخراو بۆ ناو دڵی ماسۆنیەتی ئەورووپا تا بیکاتە بنکەی سەرەکی شانە نوستوەکانی ئەوانەی کە هەڵ دەستن بە ڕێك خستنی کۆڕە ماسۆنیەکان لە تەواوی فەرەنسادا. دواتر هەڵ دەستێت بە هەڵسان بە ئەرکەکانی لە ژێر پەردەی کارە خێرخوازی و ئاهەنگە کۆمەڵایەتیەکان و کاتێکیش ئەم هەنگاوە جێ بەجێ ئەکرێت شانە نورانیەکان لە کۆڕەکانی ڕۆژهەلاتی مەزن پەیامی هەنگاوی دواتر وەر ئەگرن کە ئەویش پەیوەندی کردنە لە ڕێگەی ئەم کۆڕانەوە بە کەسە دەست ڕۆیشتوەکان ئەوانەی کە جولەکە نین و خاوەن دەسەلاتن لە دەولەت و کلێسادا و دواتر کار ئەکرێت لەسەر مل کەچ کردنی ئەو کەسانە (جا بە خواستی خۆیان بێت یاخود بە زۆر) بۆ خواستی نورانیەکان ئەویش لە ڕێگەی پەوشێکی باو و بەرنامە بۆ دڕێژروا کە بریتیە لە بەرتیل دان، داوێن پیسی، هەڕەشە، پیلان، ئابڕوبردن و چەندین ڕێگەی دیکە و ئەو کاتەش ئەو کەسانە ئەشاردرێنەوە و ئەرکی بلاو کردنەوەی بانگەوازی بێ باوەڕی و پاراستنی کەسە ماندەرەکان ئەگرنە ئەستۆ.

دوای ئەوەی کە کۆڕی نورانیەکان پێك هات لەسەر ئەو خالانەی سەرەوە، کۆنت (دی میرابۆ)ی بەناوبانگ دەست بەکار بو، تا ببێتە ڕزگار کەر لەبەر ئەو

تایبەت مەندییانەی کە وای کردبو ببێتە گونجاوترین کەس بۆ ئەو ئەرکە لە فەڕەنسا.

میرابو سەر بە چینی خانەدانەکان بو و سەرباری ئەوەش خاوەن دەسەڵاتێکی زۆر بو لە نێوەندی دەسەڵاتی شاهانەدا و لە لایەکی دیکەشەوە دۆستێکی نزیکی دۆك دورلیان بو کە ئەویش بە نۆبەی خۆی مامۆستای گەورەی ماسۆنی بو هەر وەك ئەوەی پێشتر باسمان لێوە کرد، ئەنجومەنی باڵا ئەویان هەڵبژارد تا ببێتە سیمای سەرەکی شۆڕشی داهاتووی فەڕەنسا، ئەڵبەتە گرنگترین هۆکار کە پاڵی بە نورانیەکانەوە نا تا میرابۆ هەڵبژێرن لەبەر ئەوەبو کە لە ڕووی ئاکارییەوە بۆ ئەو کارە گونجاو بو، ژیانە پێ سەرەوبەرەییەکەی[٥٢] تا بینەقاقا قەرزاری کردبو و سەرباری ئەوەش وتار بێژێکی باش بو.

کەواتە ئاسان بو بۆ گەورە سو خۆرەکان نورانیەکان کە پەیوەندی بکەن بە میرابۆوە لە ڕێگەی سەرچاوەکانی خۆیانەوە ئەوانەی کە لێی کۆببونەوە و و هەواداری وتارەکانی بون و پێشنیاری ئەوەیان کرد کە دەتوانن هاوکاری بن بۆ ڕزگار بون لە قەیرانە داراییەکانی. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی کە ئەوان کردیان بریتی بو لەزیادتر نغرۆ کردنی لەناو داوێن پیسی و بەدڕەوشتی دا. بەم شێوەیە بە ئەندازەیەك قەرزاریان بو کە وای کرد بکەوێتە ژێر ڕەحمەتی ئەوانەوە.

کاتێك کە میرابۆ گەیشتە ئەو ئاستە، خاوەن قەرزەکان کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا بۆ تۆمار کردنی قەرزەکانیان و ئاساندی بە گەورە دەوڵەمەندێکی جولەکە بە ناوی (موسا مەتدلهۆن)و ئەویش خستیە ژێر باڵی خۆیەوە و دوای ماوەیەك ئاساندی بە ئافرەتێکی زۆر جوان کە ئەو کاتە جوانیەکەی لە پاریسدا دەنگی دابۆوە و لە ڕوی ئاکارەوە هیچ بەربەستێکی نەبو. ئەو ئافرەتە ناوی

---

([٥٢]) کتێبەکانی مێژو کۆکن لەسەر ئەو لایەنەی ژیانی میرابۆ. لە هەر کتێبێکی مێژویی بڕوانی کەلە سەر شۆڕشی فەڕەنسی نوسرابێت بەو شێوەیە باس لە میرابۆ ئەکات، تا ئێستاش ئەو لایەنە بە شاراوەیی ماوەتەوە کە باس لە ڕۆڵی ئەو کەسە ئەکات لە شۆڕی فەڕەنسادا.

(مەدام هیون) بو و ئەوندەی نەبرد کە میرابۆش بوە عاشقی. ئەوەندەی نەبرد کە ئەم دوانە بونە خۆشەویستی یەکدی. بەم شێوەیە میرابو لە لایەك بو بە ژێر قەرزەوە و کەوتە ژێر ڕەحمەتی مەندلوهنەوە و لە لایەکی دیکەشەوە کەوتە ژێر دەسەلاتی ئافرەتێکی جولەکە بە ناوی (مەدام هیون) کە لەڕێیەوە وایان لە قولاپەکە گیر کردبو وەك هەویری لێ هاتبو بەدەست نورانیەکانەوە.

نورانیەکان لەمەڕ میرابۆ هەنگاوی دواتریان ناو هەندێك نهێنی ژیانی خۆیان بۆ ئاشکرا کرد دوای ئەوەی کە سوێندی خوارد کە ئەگەر ئاشکرای بکات دوچاری مردن ئەبێتەوە، بەلام ئەوان لە هەمان کاتدا پالیان پێوە نا کە تێوە بگلێت لە هەندێك ئابروچون کە ئەوەندەی نەبرد بەلاو بۆوە. ڕەوشی ناو زڕاندن کە بە شێوەیەکی ڕێك خراو لە لایەن نورانیەکانەوە بەکار ئەهێنرا بۆ تێك شکاندنی ژیانی کەسێك، لە دژی میرابۆش بەکار هێنرا و ئەمەش هۆکار بو تا لە لایەن ئەو چینە کۆمەلایەتیەوە دەر بکرێت کە پەیوندی پێوەی هەبو: واتە چینی نەجیب زادەکان. ئەم وەدەر نانەش لەو چینە هۆکار بو بۆ پڕ بونی لە هەستی کینە و حەز کردنی بۆ تۆلە سەندنەوە و ئەمەش پالی پێوە نا شێلگیرانە کار بکات بۆ تەقاندنەوەی شۆڕش.

نورانیەکان بۆیە ڕویان تێ کرد تا سەرکردایەتی شۆڕش بگرێتە ئەستۆ و بیانپارێزێت لە فەڕەنسا. وا لە میراکۆ و دۆق گەیەنرابو کە ئامانجی ئەو جولانەوەیە ئەوەیەکە شا لویسی شانزەهەم ناچار بکرێت تا دەست لە دەسەلات هەلبگرێت لە بەرژەوەندی دۆك دورنیان کەئەویش دەسەلات بە شێوەیەکی دیموکراتی بەجێ دەهێلێت بۆ کەسی دوای خۆی... بەم شێوەیە پیلانگێڕان خۆیان لادا لەوەی کە ئامانجی ڕاستەقینەی پیلان گێڕییەکە ئاشکرا بکەن بۆ دۆك دوربیان و میرابۆ کە بریتی بو لە نەهێشتنی شا لویس و چینی نەجیب زادە و ئەرستۆکراتەکان و گۆڕینی بەچینی ئەرستۆکراتیەتی سەرمایە و ئالتون. هۆکارێکی دیکە بۆ هەلبژاردنی دۆك دورلیان بریتی بو لە – جگە لەوەی کە کوڕی مامی شا بو – وەی کە مامۆستای مەزنی ماسۆنیەتی فەڕەنسی بو.

کۆڕی نورانی باڵا وایزهاوبتی ڕاسپارد تا ئەرکی هاوئاهەنگی مەراسیمی نورانیەکان بکات لەگەڵ مەراسیمی ماسۆنیەکان لە کۆڕەکانی ڕۆژهەڵاتی مەزن. میرابۆ هاتە فرانکفۆرت لە بارەگای وایزهاوبت بە هاوەڵی دورلیان و گەنجێک کە دەبێتە ناودار ترین سیاسی فەڕەنسا لە مێژوودا کە ئەویش (تالیران)ە[٥٢]، میرابۆ ئەو گەنجەی ناساند بە وایزهاوبت و ئەویش بە نۆبەی خۆی پەیڕەو نامەی نوێی ماسۆنی بۆ خستنە ڕو. دۆک دۆرلیان لە ساڵی ١٧٧٣ەوە دەستی کردە گۆڕینی ماسۆنیەتی فەڕەنسی و تێهەڵکێش کردنی مەراسیمی نوێ، تا ساڵی ١٧٨٨ زیادتر لە دو هەزار کۆڕ هەبو لە فەڕەنسا کە سەر بە کۆڕی ڕۆژهەڵاتی گەورەبون و زیادتر لە سەد هەزار ئەندامی هەبو.

بەم شێوەیە قۆناغی سەرەتای تەواو دەبێت و نورانیەتی جولەکە بە سەرۆکایەتی موسا مندلهۆن دزەی کردە ناو دڵی ماسۆنیەتی ئەورروپا و زاڵ بو بەسەریدا بە پێی ئەو کەشەی کە نادەم وایزهاوبت هێنابویە ئاراوە.

---

([٥٢]) تالیران لەو بەناوبانگترە کە بناسرێت. ئەرکەسە بلیمەتەیە کە هار سەردەمی پادشایەتی و شۆڕش و ناپلیۆن و گەڕانەوەی پادشایەتی بو بۆ فەڕەنسا و لەو سەردەمەدا و سەرباری گۆڕاکاریەکان بە یەکێک لە ستونەکانی فەرمان ڕەوایەتی و سیاسەت دادەنرا و ڕۆڵێکی سەرەکی گێڕا لە سیاسەتی ئەورروپا لە بەشی یەکەم لە سەدەی نۆزدەهەم ١٧٥٤-١٨٣٨.

## قۆناغی دووەم

میرابۆ و دۆك ئۆرلیان:

دوای ئەوەی کە میرابۆ سەرکەوتو بو لە ئەرکەکەیدا و توانی کە وا لە دۆك ئۆرلیان بکات کە ماسۆنیەتی نیشتیمانی فەرەنسی کە ناسرابو بە ماسۆنیەتی شین تێکەڵ بکات لەگەڵ کۆڕەکانی ڕۆژهەڵاتی گەورە یاخود ماسۆنیەتی نورانی و بەم شێوەیە پاڵی بە هاوەڵەکەیەوە ئەنا تا بخزێتە ناو بەد ڕەوشتییەك کە گەیاندییە تەریك کەوتنی لە ڕوی کۆمەڵایەتیەوە.. میرابۆ لەم ئەرکەشدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا بە شێوەیەك کە چوار ساڵ تێنەپەڕیبو کە دۆك ئۆرلیان کەوتە ژێر باری قەرزێکی زۆرەوە بە شێوەیەك کە بە هیچ شێوەیەك هیچ دەرفەتێکی نەدەدۆزیەوە جگەلەوەی کە بەشداری بکات لە پرۆسەکانی بەقاچاخ بردن و بازرگانی قەدەغەکرا و بۆ ئەوەی قەرەبوی زیانەکانی بکاتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرچڵییەکانی شکستی دەهێنا و بە شێوەیەکی نادیار ئاشکرا دەبو.. ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە هەڵوێستی قورستر بکات و لەچاو پێشتر قەرزەانی زیادتر بکات. بەم شێوەیە قەرزەکانی لە ساڵی ١٧٨٠ گەیشتە (٨٠٠,٠٠٠)لیرەی فەرەنسی، ئەم برە پارەیەش زۆر بو بە پێی دراوی ئەو سەردەمە هەر ئەو کاتەش دوبارە سوخۆرەکان هاتنەوە پێشەوە بۆ پێشکەش کردنی ڕێنویی و هاوکاری دراییی.

سوخۆرەکان زۆر زیرەکانە هەڵسان بە پلانگێران لە دژی دۆك ئۆرلیان بە شێوەیەك دۆخی ئەوەندە خراپ بو کە سەرەتا هیچ ڕێگەیەکی لەبەر دەستا نەما جگەلە خەواندنی تەواوی موڵك و ماڵەکەی و تەنانەت کۆشکی سەمای باڵێی

نیشتیمانی و هەڵسا بە واژۆکردن لەسەر ئەوەی رێگە بدات بە تەواوی خاوەن قەرزەکان کە تەواوی موڵك و ماڵەکەی بە رێوەبەرن تا قەرزەکانی خۆیانی لێ هەڵگرنەوە و برە پارەیەکیش بۆ خۆی دابین بکەن بۆ ژیان. دۆك ئۆرلیان واژۆی لەسەر ئەو گرێبەستە کرد و پێی وابو کە موڵك و ماڵەکەی لەدەست کەسانێکە کە ئەتوانن بە رێوەی بەرن و زیانەکانی بکەن بە قازانج... بێگومان ئەو هەستی بەو چاڵە نەکرد کە لەژێر پێیدا هەڵکەنرابو ئەمەش وایکرد کە بکەوێتە ناو ئەو داوەی کە بە گیان و بە جەستە خستییە ژێر رەحمەتی پیاوانی ئەهریمەن سیفەتەوە... بەڵام ئیدی ئەو نەیدەتوانی کە ئاراستەی رووداوەکان بگۆڕێت تەنانەت گەر بیشیویستایە لەبەر ئەوەی هەر لە رۆژی یەکەمەوە نێچیرێکی دەست و پێ بەستراو بو لە دەستیاندا. هێزە شاراوەکان جولەکەیەکیان دیاری کرد کە بە رەچەڵەك ئیسپانی بو تا سەرپەرشتی موڵك و ماڵ و کۆشکی باڵێی نیشتیمانی دۆك ئۆرلیان بکات. ئەو کەسەش کە ئەو کارەی پێ سپێردرا کەس نەبو جگە لە (کودبرلوس دی لاکلو) کە ئەو کاتە لە ترۆپکی ناوبانگی دابو دوای نوسینی (پەیوەندییە ترسناکەکان) و چەندین چیرۆکی ئابڕوبەرانەی دیکە هەروەها ناوبانگی بەوە دەرکردبو کە بە شێوەیەکی ئاشکرا پشتیوانی لە بەدڕەوشتی و بەرەڵایی ئەکرد. لەم کتێبەدا بەلامانەوە گرنگ نیە کە کارەکانی (کوبیلوس دی لاکلو) هەڵبسەنگێنین، ئەو هەستا بە کردنی کۆشکی باڵێی نیشتیمانی بە گەورەترین و بەناوبانگترین خانەی ڕابواردن و بەد ڕەوشتی لە جیهاندا... بەو شێوەیە کۆشکێکی شاهانەی کردە بارەگای کاری بەدڕەوشتی و بەرەڵایی و بێ بەری لە هەر هەستێکی شەرم و ئەنگی، ئەوانەی کە سەردانیان ئەکرد هەستیان بە هیچ جۆرە ئەنگییەك نەدەکرد، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەستا بە ئاسانکاری کردن بۆ پیاوان و ژنان تا هەرچییەك کە حەزی پێ دەکەن لەو شوێنەدا ئەنجامی بەدەن...

بەم شێوەیە باڵێی کۆشکی نیشتیمانی بەسەرجەم ئەو داستان و چیرۆکانەی لێوە سەرچاوەی ئەگرت بوە ئەو نێوەندەی کە ڕێك خرابو بۆ تێك شکاندنی باوەڕی ئاینی و ئاکاری گشتی لە فەڕەنسا.

(کودبرلوس دی کلو) لەو ئەرکەیدا بەتەنها نەبو بەڵکو هاوکارێکی هەبو بەناوی (کالبسترو)[*] کە جولەکەبو و لەبنەمادا لە شاری پارمای ئیتاڵیاوە هاتبو و ناوی ڕاستەقینەی (جۆزێف بالسامو) بو. ئەم کەسە یەکێك لە خانوەکانی دۆك ئۆرلیانی کردبو بە نێوەندی چاپ و دەستی کرد بە بڵاو کردنەوەی ئەو بەیاننامانەی کە هانی شۆڕشیان ئەدا و ڕسواییەکانی بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش بڵاو ئەکردەوە. هەروەها هەستا بە ڕێکخستنی چەند هاندەرێك کە تایبەت مەند بون بە بەستنی کۆبونەوە و ئاهەنگ و شانۆگەری و وتار دان و ڕوبەڕوبونەوەی گشتی لە چوارچێوەی جوڵانەوەیەکی گشتی کە کار ئەکات لەسەر جوڵاندنی هەستی جەماوەر، هەروەها کالیسترۆ هەتا بە ڕێکخستنی تۆڕێك لە سیخوڕ و بڵاو کردنەوەیان لە گشت شوێنێك بە ئامانجی زانیاری کۆکردنەوە لە ڕسواییەکان و گەیاندنی بە شوێنی مەبەست تا ئەویش هەستێت بە ڕێکخستنی هەڵمەتی ناوزڕاندن بە ئامانجی لەناو بردنی قوربانییەکانی.. ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە دەکەونە داوی (دی لاکلو) و (بالسامو) ئیدی ئەبنە نێچیری پارەلێکێشانەوە و هەڕەشەکردن بە ئابڕوبردن.

ئەوەندە گوشاریان ئەخرێتە سەر تا ئەبنە دەردەست و ئەوە جێبەجێ ئەکەن کە لێیان داوا ئەکرێت، بەم شێوەیەش موڵك وماڵی دۆك ئۆرلیان ئەبێتە نێوەندی ڕێکخستنی شۆڕش، شانەکان خزانە ناو کۆڕ و کۆبونەوە ڕۆشنبیری، شانۆگەری، پێشەنگای هونەری و یانە وەرزشیەکان تا وای کرد کە ئەو جێگایانە بکرێتە شوێنی قومارکردن و بەدڕەوشتی و بەکار هێنانی مادەی هۆشبەر. بەم شێوەیە نێوەندەکانی بەد ڕەوشتی لەگشت شوێنێك دا بڵاو بوەوە.

ئەم شانانە سەرکردەکانی شۆڕشی فەرەنسی بانگهێشتی ئەو جیهانە ئەکرد و ئەخرانە باوەشی بەد ڕەوشتی تا ویژدانیان ئەمرد و ئەبون بەکەسێکی بەد

---

([*]) کالبسترو بەر لە شۆڕی فەرەنسا وەك جادوگەر ناوبانگی دەرکردبو و بەشداری کردبو لە چەندین ئابڕوچونی کۆمەڵایەتی گەورەدا و چەندین خانەوادە و خانمانی چینە سەردەستەکان تێوە گلان تەنانەت (ماری ئەنتوانێتیش)، ناوبانگ دەرکردنی بە جادوگەر هەرایەکی زۆری نایەوە دەرەجام لە سێدارە درا.

ڕەوشت، ئەم پڕۆسانە لەلایەن ئەو نێوەندانەوە بە ڕێوەئەبرا کە دەکەوتنە ناو موڵکەکانی دۆک ئۆرلیان بە تایبەت کۆشکی بالێیی ڕۆیاڵ بە شێوەیەك کە ئەو موڵکو ماڵە بونە کارخانەیەکی ڕاستەقینە و لەو کەسانەش داش گەلێکی تایبەت دروست ئەکرا بۆ بەکار هێنانیان لە گەمەی شەترنەج و فەڕەنسا کرایە تەختەی شانۆگەرییەکە. مێژو نوسی بەڕیتانی (سکودەر) لە بارەی کۆشکی بالێی نیشتیمانییەوە لە کتێبەکەی بە ناوی (میری خوێن) ئەڵێت: (تەنها ئەم کۆشکە بۆ پۆلیسی فەڕەنسا هێندەی تەواوی پاریس سەر ئێشەی دروست کردبو).

بەڵام سەبارەت بە گەلی فەڕەنسا، ئەم کۆشکەی کە بۆنی ئابڕوچونی لێ دەهات هیچ نەبو جگە لە بارەگای سەرەکی دۆك ئۆرلیان کوڕی مامی شای فەڕەنسا لەبەر ئەوەی جگە لە چەند پیاو و ژنێك کەس نەی دەزانی کە ئەو کۆشکە لە ژێر دەسەڵاتی جولەکەکاندایە و تەرخان کراوە بۆ ئەو کارە نەشیاوانە وەك پێشەکییەك بۆ گورزی داهاتوتر لە دۆسێی تۆڵە سەندنەوەیان لە مرۆڤایەتی.

حکومەتی فەڕەنسا بێ ئاگا نەبو لەوەی کە ڕوی دەدا لەبەر ئەوەی هەر لە سەرەتاوە هۆشداری پێ گەیشتبو. پێشتر باسی ئەوەمان کردبو کە چۆن حکومەتی باڤاریا دوای مردنی پەیامنێری پیلانگێڕییەکە بەڵگە نامەکانی دەست کەوت و چۆن پەلاماری بارەگای نورانیەکانی دا و توانی بەڵگە نامەی دیکی دەست بکەوێت لەسەر قوڵی ئەو پیلان گێڕییە و پەل هاویشتنی لە تەواوی ئەورروپادا. هەر بۆیە باڤاریا بە پێویستی زانی کە وڵاتە پەیوەندی دارەکان ئاگادار بکاتەوە و بەم شێوەیە زانیارییەکانی گەیاندە حکومەتەکانی فەڕەنسا، ئینگلتەرا، پۆڵۆنیا، جیرمانیا، نەمسا و ڕوسیا. بەڵام ئەوەی ڕوی دا ئەوە بو کە ئەو دەوڵەتانە ڕێوشوێنی یەکلاکەرەوەیان نەگرتە بەر بۆ ڕێگری کردن لەو هێرشە بەڵکو بە کەمتەرخەمییەوە لە بابەتەکەیان ڕوانی. هەر وەك ڕونە هۆکاری ئەو کارە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزە شاراوانەی کە دەسەڵاتیان لە وڵاتەکانی خۆیان لە دەسەڵاتی حکومەتەکانیان زیادتر بو.

هێزه پیلان گێڕەکان هاوپەیمانێکی دیکەیان هەبو لە دڵی گەلە بێتاوانەکاندا، مەبەستیشمان ئەو کەسە ئاساییانەن کە باوەڕیان بەخوا هەیە و لە خێر خۆشیدا ئەژین، بۆنمونە کەسێکی لەم چەشنە - پیاو بێت یاخود ژن - ناتوانێت باوەڕ بەوە بهێنێت کە پلانێك هەیە بۆ خراپە و کینە و تۆڵەسەندنەوە کە پیادە ئەکرێت لە لایەن مرۆڤەکانەوە، هەروەها سەختە بۆ موسوڵمانانەی کە سەردانی ماڵی خواوەند ئەکەن بۆ بەجێ گەیاندنی ڕێوڕەسمە ئاینیەکانیان - ئەو ڕێوڕەسمانەی کە بانگەشەی خێر و بەرەکەتی خواوەند ئەکەن- باوەڕ بەوە بهێنن کە ئاینێکی دیکەی خراپە کار هەبێت، ئەو ئایینەش ئاینی نورانیەکانە کە هەستان بە شێواندنی ئایینی جولەکە و ماسۆنیەت و کردیانە ڕێوڕەسمی بت پەرەستی لەسەر بنەمای چاندنی تۆوی خراپە و کینە لەدڵی خەڵك و ویژدانەکان و کار ئەکەن لەسەر ئەوەی کە لایەنگرەکانیان بکەن ئامراز گەلێك بۆ جێبەجێ کردنی خواستە خراپەکانیان... پەڕەکانی دواتر وێنەیەکی ڕاستەقینەی ڕوداوەکانی فەڕەنسامان نیشان ئەدەن، ئەو ڕوداوانەی کە بەڕونی بۆمان دەردەخەن کە چۆن ئەو هۆشدارییە نەیتوانی خەڵکی لەو خەوە بە ئاگا بهێنێتەوە و کەس و حکومەتەکان وریا بکاتەوە لە مەترسی پیلانگێڕی جیهانی...

### "گەڕانەوەیەك بۆ ڕوداوەکانی شۆڕی فەڕەنسا - ماری ئەنتوانێتی شاژن"

دوای ئەوەی کە وڵاتە ئەورروپیەکان هیچ کاردانەوەیەکیان نیشان نەدا بۆ هۆشداریەکانی حکومەتی باڤاریا، خوشکی ئەنتوانێتی شاژن چەند نامەیەکی یەك لەدوای یەکی بۆ نارد تا ئاگادری بکاتەوە لە نەخشەی پیلانەکە و ڕۆڵی سوخۆرەکان و خاوەن ئاڵتون و سەرمایە جیهانیەکان تیایدا کە بریتین لە کۆڕە ماسۆنیەکانی فەڕەنسا. بەڵام ماری ئەنتوانێت شاژنی فەڕەنسا و کچی ئیمپراتۆری نەمسا (فرانسوای یەکەم) نەیتوانی باوەڕ بهێنێت بەو شتانەی کە کچەکەی لەو بارەوە ئەیلێت... کاتێکیش کە خوشکەکەی سور بو لە نامەکانیدا

لە سەر ئەوەی کە بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی نورانیەکان لە فەڕەنسا کار ئەکەن لە ژێر پەردەی ماسۆنیەت و کاری خێرخوازانەدا بە ئامانجی تێکدانی دەوڵەت و کڵێسا لە فەڕەنسا، ماری ئەنتوانێت لە یەکێك لە نامەکانیدا بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: "ئەوەی کە پەیوەندی بە فەڕەنساوە هەبێت من پێم وایە کە نیگەرانییەکەت لە بارەی ماسۆنیەتەوە زیادەڕەوی پێوە دیارە لەبەر ئەوەی لێرە کەمترە لە چاو تەواوی شوێنەکانی دیکەی ئەورووپا... ".

مێژو بە ئەندازەی پێویست بۆمان دەردەخات کە چەندە ماری ئەناتوانێت هەڵە بوە، ئەو هەڵەیەی کەلەسەر ژیانی خۆیی و هاوسەرەکەی لویسی شانزەهەم کەوت... زۆرێك لە هەوادارانی مێژوو پێیان وایەك کە ماری ئەنتوانێت ئافرەتێکی سادە بوە و لەگەڵ شەپۆلی خۆشگوزەرانی دا ڕۆیشتوە کە ئەوکاتە لە کۆشکدا بەر بڵاو بوە، هەروەها باس لە چیرۆك گەلێکی خۆشەویستی ئەکرێت کە تێوەی گلاوە سەرباری ناپاکی کردنی بەرامبەر بە هاوسەرەکەی لەگەڵ نزیکترین هاوڕێی هاوسەرەکەی دا... بەڵام ڕاستیەکەی ئەمە ئەو وێنەیە بو کە (بالسامو) کێشابوی لە چوارچێوەی هەڵمەتێکی ناو زڕاندن تا ئەو وێنەیە لەمێشکی خەڵکیدا بچێنن.. بەو شێوەیەش پاڵیان بە جەماوەرەوە نا تا داوای سەری بکەن... بەڵام مێژو نوسەکان دەڵێن ئەگەر ئافرەتێك خاونی ئەو خەسڵەتانە بوایە کە باسی لێوە ئەکەن، نەیدەتوانی بەو شێوەیە بەرگەی لێدان و ئەو چەرمەسەریانە بێتەوە کە ڕو بەڕوی بۆوە و نەشیدەتوانی خۆڕاگر بێت لە بەرامبەر تیغی میقسەڵەدا...

ئەو پرسە بەناوبانگەی کە لە مێژودا بە پرسی گەردنبەند ناسراوە یەکێکی دیکە بو لەو هەڵمەتی ناوزڕاندنانەی کە لە دژی ماری ئەنتوانێت پیادە کرا... بیرۆکەی ئەم پرسەش لە ئەندێشەی وایزهاوپت و ماندلسوهن دروست بو بەم شێوەیە: قەیرانی ئابوری ببوە وێردی سەرزمانی هەموان و خەزێنەی فەڕەنساش نیمچە بەتاڵ بو و حکومەتی فەڕەنساش ناچار بو کە لە سوخۆرە جیهانیەکان جارێکی دیکە داوای قەرز بکات، هەردو سەرکردەی پیلانگێڕی نوێنەرێکیان نارد بۆ کۆشکی پادشایەتی فەڕەنسا بە مەبەستی گەیاندنی

گەردنبەندێکی دروست کراو لە سەر داوای شاژن، ئەو گەردن بەندە بە خشڵی گران بەها دروست کراب و بەهاکەی دەگەیشتە دوسەد و پەنجا هەزار لیرەی فەرەنسی کە پارەیەکی خەیاڵی بو بە پێی دراوی ئەو سەردەمە، ئەو زەرەنگەرە ئەو گەردن بەندەی هێنا بۆ ناو کۆشك تا پیشانی شاژنی بدات، بەڵام ماری ئەنتوانێت ئەو گەردن بەندەی ڕەتکردەوە و ئەوشی بەدرۆ خستەوە کە گوایە لەسەر داوای ئەو ئەو گەردن بەندە دروست کرابێت... بەڵام پێشتر چیرۆکەکان لەسەر ئەو گەردنبەندە ئەفسانەییە لەگشت شوێنێك دا بڵاو ببۆوە هەروەك چۆن پیلان گێڕان پیلانیان بۆ داڕشتبو، ئەو پڕو پاگەندەیەی کە بالسامو کاری لەسەر ئەکرد بە تەواوی هێزەوە کاری ئەکرد و ئەوەندەی نەخایاند کە ماری ئەنتوانێت ڕوبەڕوی ڕەخنە و توانجێکی زۆر بوەوە لەسەر دەست بڵاوی و بەفیڕۆدانی پارە، لە دەرەنجامی ئەو هەڵمەتەش کەلە دژی بەرپا کرا ناوبانگی لەدەست دا... لە دۆخێکی لەو چەشنەدا ئەستەم بو سەرچاوەی پڕوپاگەندەکان دیاری بکرێت.

کاتێکیش کە هەڵمەتەکە گەیشتە ترۆپك، (بالسامو) لێدانی یەکلا کەرەوەی بەکار هێنا و چاپخانەکانی بەهەزارەها بڵاو کراوەی گاڵتەجاڕی بڵاو کردەوە لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستێکی نهێنی ماری ئەنتوانێت ئەو گەردنبەندەی پێش کەش کردوە لەبەر ئەو پەیوەندییەی کە بوە لە نێوانیاندا...

ئەڵبەتە کارەکە هەر لێرەدا نەوەستا، بەڵکو پیلانگێڕانی ناو زڕاندن بیرۆکەیەکی ئەهریمەنانەی دیکەیا دۆزیەوە: نامەیەکیان ساختە کرد کە گوایە نێردرابو بۆ یەکێك لە گەورە ئەمیرەکانی فەڕەنسا کەلە هەمان کاتدا یەکێك بو کەلە پیاوانی ئاینی کڵێسا، ئەو کەسە کاردینالْ دی ڕۆمان بو، لەو نامەیەدا کە بە ناوی ماری ئەنتوانێتەوە نێردرابو و واژۆکەی لەسەر نامەکە ساختە کرابو، شاژن داوا لە کاردینالْ ئەکات کە نیوەی شەو لە شوێنێکی دورەپەرێز لەناو باخەکانی کۆشکی باڵێی نیشتیمانی ببینێت... پیلان گێڕان ئافرەتێکی لەشفرۆشیان ئامادە کرد تا بە بەرگی شاژنەوە و بەشەو بچێت بۆ بینینی

کاردینال. ئەوەندەی ئەبرد لە تەواوی فەرەنساوە لێشاوی رەخنە روی لە شاژن کرد و ناوبانگی ئەو و یەکێك لە گەورە پیاوانی ئاینی کڵێسای زڕاند.

مێژو بۆمان رون ئەکاتەوە کە چۆن دواتر ئەو گەردنبەندە گوازرایەوە بۆ ئینگلتەرا دوای ئەوەی کە لە فەرەنسا ئەرکی خۆی بەجێ گەیاند، وەك باسی لێوە ئەکرێت تەواوی خشڵە بەنرخەکانی ئەو گەردن بەندە لە لای جولەکەیەك پارێزراوە لە لەندەن بەناوی (ئەلیاسون). بەڵگەیەکی دی هەیە دەیسەلمێنێت کە سوخۆرە ئینگلیزەکان پەیوەندییان بەو پیلان گێڕییەوە هەبو کە بوە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕی فەرەنسا. ئەم بەڵگەیە تا ساڵانێکی زۆر هەر بە نهێنی مایەوە تا ئەو کاتەی کە (ئەلادی کوبنسبورو) خێزانی لۆرد کوبنسبورو نوسەری کتێبی (حوکمڕانی شاراوەی پیاوانی ئاینی) بڵاو کردەوە. ئەو بەڵگە نامەیەی لە کاتی گەڕانیدا دۆزیەوە لەناو کتێبێکی کۆندا لەژێر ناونیشانی (دژایەتی کردنی جلەکە کەلە ساڵی ١٨٤٩ دا نوسراوە لە لایەن کەسێکی جولەکە بەناوی گۆڵد شمیت). خاتو کبنسورو ئاواتی ئەوەی خواست کە لەبەر ئەو زانیارییانەی کەلەو چاپکراوە بەدەستی هێناوە ئەو بەڵگەیە بەدەست بهێنێت لەسەر. ئەوەی کە گۆڵد شمیت و براکەی ئیبراهام گۆڵد شمیت و هاوبەشێکیان بەناوی موسا میکاتا و برازی ئەمەی دواییان کە دواتر نازناوی نەجیبزادەی ئینگلیزی پێ بەخشرا و بو بە سێر موسا مونتیفیور، سەرجەم ئەم کەسانە لە گەورە سەرمایەدارەکانی ئینگلتەرا بون کە لە ڕاستیدا سەر بە سەرمایە دارە جولەکەکان بون لە ئەوروپا کەلە چوار چێوەی ڕێکخراوێکدا کار ئەکەن کەئامادە کاری بۆ شۆڕشەکەی فەرەنسا کرد، دواتر چەند بەڵگە نامەیەکی دیکەش دەست کەوت کە سەلماندی جولەکەی ئەڵمانی گەشتیار دانیال ئیشتینگ و کوڕی هاوسەرەکەی داود فرید لاندەر و جولەکەی ئەلزاسی (هرزغیربەر) بە نۆبەی خۆیان بازنەیەکیان پێك هێنابو کە کاری ئەکرد لەژێر ڕابەرایەتی ڕۆتشیلد. بەم شێوەیە پەردە لەسەر ئەو کەسان لادەچێت کە ئەو کاتە ئەو هێزە بون لەپشت پیلان گێڕییەکانەوە. لێرەدا پێویستمان بەوە نییە کە ئاماژە بدەین بە بایەخی ئەو لێکۆڵینەوەیانەی کە جولەکە خاوەن

سەرمایەکان بەکاریان ئەهێنا لە مانۆڕەکانیاندا و توانیان حکومەتی پادشایەتی دوچار بە قەیرانی دارایی بکەن.. ئەتوانین لە ڕێگەی بەراورد و بیرکردنەوەوە بگەینە ئەوەی کە بزانین چ ڕەوش گەلێك لەو کاتەوە بەکار هاتوە لە ڕوسیا و ئیسپانیا و ئەمەریکا.

مێژونوس و نوسەری بەناوبانگی بەریتانی سێر والتەر سکۆت لەبارەی ئەو ڕەوشانەوە ئەڵێت: ئەو کەسانە بە شێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ حکومەتی فەرەنسادا کرد وەك چۆن سوخۆرێك مامەڵە لەگەڵ کەسێکی دەست بڵاودا بکات کە پارەیەکی زۆری بۆمابێتەوە.. بە شێوەیەك کە بەدەستێك پارەی زۆر و بەسوی دەدەنێ بۆ دەست بڵاویەکانی و بەدەستێکیش سودی زۆری قەرزەکانیان وەرئەگرنەوە و ئەمەش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەبێتە هۆی مایەپوچی. بەم شێوەیە زنجیرەیەك قەرزی ڕوخێنەری ئەو سوخۆرانە یەك بەدوای یەکدا هات و بە دوای ئەویشدا وەك گرەنتی کۆمەڵێك دەستکەوتی دیکەیان بەدەست هێنا و بەم شێوەیە باری دارایی دەوڵەتی فەرەنسا پەشێوی بەخۆوە بینی[°°] دوای ئەوەی کە حکومەتی فەرەنسا کەوتە دۆخێکەوە کە ئیدی خۆی ناچار بینیەوە قەرز بە سودی زۆرەوە وەربگرێت تا تێچووەکانی ئەو جەنگەی پێ تاوتوێ بکات کە هەڵدرابوە ناوی. ئەو قەرز دەرانە بەو پەڕی ڕەزامەندییەوە قەرزەکانیان ئەدا لەبەرامبەر مەرجێکی سەرەکی دا: ئەویش ڕێگە پێدانیان بەوەی کە چەکی قەرزەکان بنوسن بەو مەرجەی کە ئەیانەوێت، ئەو مەرجانەش لە قۆناغی یەکەمدا گومانێکی ئەوتۆی دروست نەدەکرد بەڵام لە ڕاستیدا جۆرێك بو لە تەڵە کە لە ڕێگەیەوە توانیان مارەکە بخەنە ناو ژورەکەوە هەروەك چۆن پەندێکی فەرەنسی ئەڵێت، واتە ناردنە ژورەوەی

---

([°°]) سەرباری ئەو پێگە گرنگەی کە سێر والتەر سکوت هەیەتی و ئەو ڕاستیانەش کە لە نوسینەکانیدا پەردەی لەسەر هەڵماڵرا، پاڵی بەو کەسانەوە نا کە دەسیان گرتبو بەسەر چاپەمەنی و بڵاو کراوەکاندا کە بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ کتێبەکەی دا بکەن کە باس لە شۆڕی فەرەنسا ئەکات تا لە بیر بچێتەوە. ئێستاکە ئەو کتێبانە تەنها لە مۆزەخانەکاندا ئەدۆزرێنەوە. ئەو کتێبخانانەش کە کتێبەکانی ئەو نمایش ئەکەن، ئەوە لە یاد ئەکەن کەناوی کتێبەکانی ئەو بهێنن.

نوێنەرەکەیان بۆ ناو دڵی حکومەتی فەرەنسا.. ئەو نوێنەرەش کەسێك نەبو جگە لە (نیکەر) کە شا کردبوی بە وەزیر و تەواوی دەسەڵاتی پێدرابو لە کاروباری داراییدا. جولەکە سوخۆرەکان پڕپاگەندەیەکی گەورەیان بڵاو کردبۆوە لەسەر نیکەر بەو ناوەرۆکەی کەتەنها ئەوە دەتوانێت فەرەنسا لەو دۆخەی کە تێی کەوتوە دەربهێنێت[٥٦].. بەڵام لە ڕاستیدا لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا کە ئەو وەزیری دارایی بو بەئەندازەیەك خراپ بو کە بڕی قەرزی حکومەتی فەرەنسا گەیشتە (١٧٠) ملیۆن جونەیهی ئستەرلینی بە دراوی ئەو سەردەمە... ئەو بڕە پارەیەش بە پێی بەهای ئەو سەدەمە ڕێژەیەکی زۆر بەرز بو.

مێژونوسی ئینگلیزی (رامزی) لە کتێبەکەی دا بە ناونیشانی (جەنگێکی بێ ناو) بەو شێوەیە باس لەو دۆخە ئەکات: "شۆڕشی فەرەنسا وەك لێدانێك بو لە جەستەیەکی ئیفلیج، بەو پێیەی کە چنگی قەرز لە قوڵایی ئەو جەستەیە گیر ببوو و لە لایەکی دیکەشەوە سوخۆرەکان دەستیان گرتبو بەسەر تەواوی چالاکی سیاسی و ڕاگەیاندنی ئەو سەردەمەدا . زۆری نەخایاند کە ئەو چنگە لە کەرتی پیشەسازی فەرەنساش گیر بو (بە هەردو لایەنی خاوەن کار و کرێکار) بەم شێوەیەش تەختەی شانۆکە بە تەواوەتی ئامادە بو دەست کردن بە شۆڕش و کاتێکیش کە دەستی چەپی نەخشە بۆ درێژەرانی پیلانەکە بەرز بوەوە تا خەنجەر بدات لەجەستەی پادشایەتی نزیك لە کەوتن، دەستی ڕاست ئەو بێ ئاکارییە بو کە بە تەواوەتی جەستەی پەکخستبو. لە کاتێکدا کە بڵاوکراوە بە لاڕێ بەرەکانی (بالسامو) لەعنەتی بەسەر شا و شاژندا دا دەباراند، سەرچاوەکانی پیلان گێڕی مەشقیان بەو کەسانە ئەکرد کە بڕیار درابو لەسەر ئەوەی کە بکرێنە سەرکردەکانی تیرۆر، ئەو سەرکردانەی کە دوای ڕوخاندنی دەسەڵاتی پادشایەتی دەسەڵات دەگرنە دەست. لەو سەرکردانەش

---

([٥٦]) ئاوەکو ئێستا کتێبەکانی مێژو بە شێوەیەك باس لە نیکەر ئەکات وەك ئەوەی لە لایەن خواوە نێردرابێت بۆ ڕزگار کردنی فەرەنسا.. کتێبەکانی خوێندنیش زۆر بە خۆی و بەکارە کانیدا هەڵ ئەدات.

(ڕۆبسبیر)ی بەناوبانگ و (دانتۆن) و (مارا) بون کە ئەوانیش ناوبانگیان کەمتر نەبو لە چاو ڕۆبسبیر دا...

کەسە تۆڵە سێنەکان خۆیان ئامادە کردبو کە هێرش بکەنە سەر باستیل بۆ ئازاد کردنی زیندانیەکان و کەسانێکی دیکەش خۆیان ئامادە کردبو کە دۆخێك دروست بکەن دوای دەسەلات گرتنە دەست کە ئەبێتە هۆی هاتنە ئاراوەی پێش وەختی دەسەلاتی تیرۆر، ئەم کەسانە لە کلێسایەك لە فەرەنسا دانیشتنیان ئەکرد کە پێی دەوترا کلێسای (یەعقوبیەکان) بەم شێوەیە وردە کاری ئەو پلانە خوێناوییە لەنێوان دیوارەکانی ئەو کلێسایەدا داڕێژرا، هەر لەو شوێنە خشتە ئامادەکرا بۆ لەناو بردنی ئەو نەجیب زادە و کەسانەی کە لایەنگری ڕژێمی پێشوبون. هەر لەو شوێنە بڕیار لەسەر ئەوە درا کە هاندەرەکانی شۆڕش و دوای ئەوانیش تاوانبارەکان هەستن بە ئەنجامدانی کوشتن و سەربڕین و دەست درێژی کردنی ئاشکرا تا ترس بخەنە ناخی دانیشتوانەوە و لە هەمان کاتدا مانوێل کە کرابو بە دادیاری گشتی (کۆمۆنەکان/واتە حکومەتی شۆڕگێڕی داهاتوی پاریس) هەڵ دەستێت بە لەناو بردنی تەواوی ئەو کەسانەی کە ناسرابون بە دڵسۆزی پادشا و وڵات. بەم شێوەیە لە یانەی یەعقوبیەکان مەشق کرا لەسەر تیرۆر بەو پیاوانەی کە خۆیان ئامادە کردبو بە دەست پێکردن لە شانەکانی پیلانگێڕیی ڕێکخراوەوە تا هەستن بە کاری تاوانی ئاشکرا و بەکۆمەڵ بە پێی ڕێنمایی هێزە شاراوەکان، بەم شێوەیە پیلانگێڕان هەنگاوێك بەرەو پێشەوە چون لەو ڕێگەیەی کە پڕی بو لە کاولکاری.

## بەشی چوارەم

# کەوتنی ناپلیۆن

ئامانجی خاوەن سەرمایە جیهانیەکان لە پلان دانان بۆ شۆڕشی فەڕەنسا ئەوە بو کە دواتر ببنە خاوەنی ڕاستەقینەی فەڕەنسا و بەو شێوەیەش ببنە ئەو دەسەڵاتە شاراوەیەی کە کۆنتڕۆڵی حکومەتەکانی ئەوروپا ئەکات لە پشت پەردەوە وەك پلانێکی دور مەودا بۆ دەست گرتن بەسەر جیهاندا.

هەروەك لە بەشی پێشتردا باسمان لێوەکرد، دوای تەقینەوەی شۆڕش ڕوداوەکان بە خێرایی ڕویاندا و سەرەتا یەعقوبیەکان دەستیان گرت بەسەر دەسەڵاتدا و بەردەوام بون لەسەر بەکار هێنانی دۆك ئۆرلیان هەروەك پێشو، دواتر داواین لێکرد کەلە ئەنجومەنی نیشتیماندا دەنگ بدات بە لە سێدارەکانی کوڕی پوری شا لویسی شانزەهەن، هەروەها ئەو باوەڕەشیان لەلا دروست کردبو کە دەکرێتە شای فەڕەنسا لە بری کوڕی پورەکەی و بەم شێوەیە دۆك دەنگی دا بە لە سێدارەکانی شا دا و بەوەش بەرپرسیارێتی ئەو کارەی گرتە ئەستۆ لە کاتێکدا کە پیلان گێڕە ڕاستەقینەکان بە شاراوەیی مانەوە.. لە کاتێکدا ئەو ڕێنماییانەی کە یەعقوبیەکان لە دەسەڵاتی شاراوەوە بەدەستیان گەیشت لەسەر بەڕێوەبردنی شۆڕشەکە جیاواز بو لەوەی کە دۆك ئۆرلیان باوەڕی پێی هەبو، ئەو ڕێنماییانە بڕیاری پاکتاوکردنی دابو دوای ئەوەی کە ببو بەبار بەسەریانەوە.. ئەوەندی نەبرد کە چەرخی ئامێرە ترسناکەکە کەوتە سوڕان: ئەم جارە ئامێری ناوزڕاندن دژی دۆك ئۆرلیان کەوتە کار هەروەك چۆن

پێشتر لە دژی ماری ئەنتوانێت کەوتبوە کار. بەو شێوەیە هێدی هێدی پەتی پیس کردنی ناوبانگی لە ملی ئاڵێنرا و بەرەو تیغی مەقسەڵە پەل کێشی ئەکرد لەگەڵ کاروانێك لە کەسە ڕاست ڕەوەکان کە ئامادە کرابون بۆ لە سێدارە دان. ئەوکاتەی کەبرا بۆ بەردەم تیغی مەقسەڵە بە گوێی خۆی بیستی کە جەماوەر مەحکومیان ئەکرد و توڕەیی خۆیان دەر ئەبڕی لە کارەکانی.

بەڵام بۆ میرابۆ کارەکە جیاواز بو، ئەو هەستی بە مەترسی ئەکرد و بۆی دەرکەوت کە ئەو وەك ئامێرێك بەکار هێنراوە، هەستی بە پەشیمانی کرد سەرباری ئەوەی کەئەو لە ڕوی ئاکارەوە هەرەسی هێنابو و نەیدەتوانی دیمەنی ئەو تاوانانە قبوڵ بکات کە یعقوبیەکان ڕۆژانە ئەنجامیان ئەدا، تەنها شتێك کە بۆ میرابو گرنگ بو ئەوبو کە دەسەلاتی ڕەها لە شا وەربگرێتەوە و بیکاتە نمایەك و وەك شایەکی بێ دەسەلات بیهێڵێتەوە و خۆشی ببێتە ڕاوێژکاری یەکەمی شا، کاتێك بۆی دەرکەوت کە ئامانجی دەسەڵاتی شاراوە ئەوەیە کە لویسی شانزەهەم بکوژرێت هەوڵی دا بیرفێنێت لە پاریس کە تیایدا زیندانی بو و بیباتە ئەو شوێنەی کە هێشتا هێزی خۆی تێدا مابو. بەڵام ئەم نەخشەیە شکستی هێنا و دەرەنجامەکەشی ئەو بو کە دەسەڵاتی شاراوە بڕیاری دا کە لە ناو ببرێت.. بەڵام بۆ ئەو دۆخەکە جیاواز بو لەبەر ئەوەی ڕێکخراوەکانی ناوبراندن کاتێکی ئەوتۆیان لەبەر دەستدا نەبو بۆ ئەو کارە هەر بۆیە پەنایان بردە بەر دەرمان خوارد کردنی و وادەرخرا کە خۆی کوشتوە.

دواتر قۆناغێکی زۆر ترسناك باڵی بەسەر پاریسدا کێشا، ئەو قۆناغەی کە لە مێژودا بە دەسەڵاتی تیرۆر ناسراوە، ئەو قۆناغەی کە ڕۆژانە بە سەدان کەس ئەبرانە بەر دەم تیغی مەقسەڵە... ئەوکاتە تیرۆر لە دو کەسدا بەرجەستە بو: (دانتون) و (ڕۆبسپیر)، کاتێکیش کەئەم دو جەلادە ڕۆڵی خۆیان بینی، سەرەتا ڕۆبسپیر، دانتۆنی هاوڕێی نارد بۆ بەردەم تیغی مەقسەڵە و دواتر ئەوەندەی نەبرد کە سەرەی خۆشی هات[٥٧].

---

(٥٧) بڕیاری ژمارە پێنج لە پەیڕەوی ناوخۆی جولەکەکان ئەڵێت: ماسۆنی لەناو ئەبرێت – ئەو کاتەی کە پێویست ئەکات – بە شێوەیەك کە نەبێتە جێگەی گومان، کاتێکیش ئەم ڕێگەیە ئەگیرێتە بەر کە ماسۆنیەك زیاد

مێژونوسی گەورە بەریتانیا والتەر سکۆت لە ڕێگەی شیکردنەوەی قوڵی ڕوداوەکانی مێژو بە تایبەت مێژوی ئەوروپا درک بەو ڕۆڵە ئەکات کە هێزە شاراوەکان ئەیانگێڕا لە پشت شۆڕشی فەرەنساوە، هەر کەسێکیش بتوانێت کتێبەگەورەکەی (ژیانی ناپلیۆن) بخوێنێتەوە ئەتوانێت وردەکاری تێوەگلانی زایۆنیزمی بۆ دەر بکەوێت لە پیلان گێڕان بۆ شۆڕشەکە، والتەر سکۆت لەو کتێبەی دا ئاماژە بۆ ڕاستیەك ئەکات کە جێگەی پرسیارە ئەویش ئەوەیە کە زۆربەی سیماکانی شۆڕش، سیمای بێگانە بون و ئەو کەسانە دەستە واژەی زمانی جولەکەیان بەکار هێناوە، ئەوەی کە زیادتر بوە جێگەی سەرنجی ڕوداوێکی دیاری کراویو کە ئەویش بریتی بو لە دەرکەوتنی ناڕونی کەسێك بەناوی (مانوێل) و دانانی لە پۆستی ئەمینداری گشتی (کۆمۆن)[٥٨]ی پاریس، ئەم مانوێلە بەر پرسیار بو لە زیندانی کردنی هەزارەها قوربانی لە زیندانەکانی فەرەنسادا، ئەو زیندانیانەی کە لە کوشارە گەورەکەی ساڵی ١٧٩٢ گیانیان لەدەست دا کە ژمارەیان تەنها لە پاریس دەگەیشتە ٨٠٠٠ زیندانی.

کەسێکی دیکەی جولەکە بەناوی (داڤید) یاخود (داود) یارمەتی مانوێلی ئەدا و ئەویش یەکێك بو لە کەسە دەست ڕۆیشتوەکان لە ئاسایشی نەتەوەیی پاریسدا کەلە کاتی شۆڕشدا ناوبانگی دەرکرد (هەروەك چۆن داڤیدیش ناوبانگی دەرکرد) بە بانگەواز کردن بۆ ڕشتنی خوێنی زیادتری قوربانیەکان. داڤید هەر ئەو کەسە بو کە بنەمای پەرستنی خوایەکی مەزنی هێنایە ئاراوە، ئەو خوایەی کە بۆ ماوەیەك جێگەی ئاینی مەسیحی گرتەوە بە پێی بڕیارێکی شۆڕش.. هەروەها سێر والتەر سکۆت ئاماژە بەوە ئەدات کە (کویر لوس دی

---

لە پێویست بزانێت". مێژونوس سودەر لە کتێبەکەی "ژیانی میرابۆ" دەڵێت کە مردنی میرابۆ لە کاتێك بو دا کە دەکرا شۆڕش بوەستێنرێت.

([٥٨]) یەکێك لە بڕگەکای ١٥ پڕۆتۆکۆلەکانی زایۆنیزم ئەڵێت: ماسۆنی لەناو ئەبرێت – کاتێك کە پێویست بکات – بە شێوەیەك کە نەبێتە جێگەی گومان بە بێ ئەوەی کە ئەندامانی کۆمەڵگە برایانمان بگرێتەوە، ئەم ڕێگەیەش کاتێك بەکار ئەهێنرێت کاتێك یەکێك لە ماسۆنیەکان زیاد لە پێویست بزانێت. سکۆدەر لە کتێبەکەی بە ناو نیشانی "ژیانی میرابۆ " ئاماژە بەوە ئەکات کە مردنی میرابۆ لە کاتێك دا ڕوی دا کە هێشتا دەرفەت هەبو بۆ وەستاندنی شۆڕش.

لاکو/ ئەو کەسەی کە پێشتر ئاماژەمان پێدا کە جولەکەیەی ئیسپانی بو) ڕۆڵێکی زۆری هەبو لە ئامادەکاری کردن بۆ شۆڕش لە کۆشکە شاهانەکەی (بالێی نیشتیمانی) ئەو شوێنەی کە کردییە جێگەیەك بۆ بەد ڕەوشتی.

بەڵام ئێمە ئەبێت ئاماژە بکەین بەوەی کە ئەو کتێبە مەزنەی کەلە نۆ بەرگ پێك دێت و لە لایەن سێر والتەر سکۆتەوە نوسراوە بە ناونیشانی ژیانی ناپلیۆن، تیایدا بە شێکی زۆر لە ڕاستیەکان خراوەتە ڕو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیوارێك بۆ لەیاد کردن بە دەوری دا هەڵ چنراوە.

هەروەها پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە لە کتێبێکی دیکەدا بە ناو نیشانی (ژیانی ڕۆبسبیر) کەلە نوسینی (ڕینێ)یە برگەیەك لە خۆ ئەگرێت کە جێگەی بایەخی زۆرە: لەو برگەیەك دا باس لە چەند وتەیەکی ڕۆبسبیر دەکات و ئێمەش لە خوارەوە ئەو وتانە و ئەو برگەیەش ئەیخەینەڕو کە تیایدا هاتوە لە کتێبەکەدا:

"لە ٢٧ نیسانی ١٧١٤ دەسەڵاتی تیرۆر گەیشتە ترۆپك، لەو ڕۆژەدا ڕۆبسبیر وتارێکی پێشکەش کرد لە بەرامبەر کۆمەڵی نیشتیمانی و تیایدا هێرشێکی توندی کردە سەر ئەوانەی ناوی لێ نابون تیرۆریستە توند ڕەوەکان، ئەم هێرشە کۆمەڵێك تۆمەت لە خۆ ئەگرێت کە بە شێوەیەکی گشتی وتراوە، واتە ئاڕاستەی کەسانێکی نادیار کراوە، دروست ئەو وشانەی کە بەکار هاتوە لە لێدوانەکەدا ڕەنگە بەم شێوەیە بوبێت: من جورئەتی ئەوە ناکەم کە ناویان لێ بنێم لەم کات و شوێنەدا... هەروەها ناتوانم پەردە لەسەر ئەم نهێنیە لابەم کەلە شۆڕشەکاندا بوە لە دێر زەمانەوە... بەڵام من ئەتوان دڵنیابم لەوەی کە ئەوانەی ئەو پیلانەیان گێڕاوە بەکرێ گیراون و بەرتیل و بەد ڕەوشتی کاری تێکردون... ئەم دوانەش لەچاو ڕەوشەکانی دیکەدا کاریگەرترین ڕەوشن کە بێگانەکان دۆزیویانەتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت، مەبەستم لەوکەسانە قەسەکانی بێ باوەڕی و داوێن پیسیە... "

دواتر ڕینێی نوسەر دەڵێت: ئەگەر ڕۆبسبیر ئەو قسانەی نەکردبایە بێ گومان لەناو نەدەبرا...

لە ڕاستیدا ڕۆبسپیر زیاد لە پێویست قسەی کرد هەر بۆیە فیشەکێك نرا بە چەناگەیەوە کە بوە هۆی بێ دەنگ کردنی بە شێوەیەکی تەواوەتی بەر لە ڕۆژێك لە بردنی بۆ بەردەم تیغی مەقسەڵە، بەم شێوەیە ماسۆنیەك لە ناو برا کە ڕێگەی پێدرابو زۆر بزانێت. تا ئێستەش زۆرێك بێ ئاگان — جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت — لەوەی کە ڕۆبسپیر و مارا و دانتۆن کە بە سەرانی قۆناغی تیرۆر دادەنرێن لە ڕاستیدا هیچ نەبون جگە لە داردەستی نورانیەکان یاخود بە مانایەکی دیکە کۆمەڵەی سیانزەهەم یا دانایانی زایۆنیزم.

دوای ئەوەی کە نەخشەی پیلان گێڕان سەرکەوتو بو لە کۆتایی هێنان بە ژیانی تەواوی ئەو کەسانەی کە بڕیار درابو کۆتاییان پێ بهێنرێت، قۆناغێکی نوێیان لە پیلانگێڕی جیهانی دەست پێکرد، ئانشلیم مایەر ڕۆتشیڵد کچەکەی (ناتان مایەر)ی نارد بۆ ئینگلتەرا بۆ کردنەوەی لقی دامەزراوەی ڕۆتشیڵد لە لەندەن و ئامانج لەو کارەش دابین کردنی پەیوەندی سوخورە جیهانیەکان لە ئینگلتەرا و ئەوروپا، چەقاندنی دەسەڵاتە سیاسی و ئابوری و دابین کردنی پەیوەندی بە شێوەیەکی تایبەت لە نێوان ئەو کەسانەی کە دەستیان گرتبو بەسەر بانکی ئینگلتەرا لەگەڵ ئەوانەی کە دەستیان گرتبو بەسەر بانکەکانی فەڕەنسا و هۆڵندا و ئەڵمانیا، ئەم ئەرکە سپێردرا بە (ناتان مایەر ڕۆتشیڵد) لە کاتێکدا کە تەمەنی زیادتر نەبو لە ٢٦ساڵ. ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئەو مەشقەی کە هەر لە منداڵیەوە بینیویەتی.

## ناپلیۆن بۆناپارت

دوای ئەم قۆناغە خاوەن سەرمایە جیهانیەکان سەرمایەگوزاریان کرد لەسەر کەسێکی دیکە کە تا دەهات زیادتر دەردەکەوت ئەویش ناپلیۆن بۆناپارت بو. لەو کاتەوە زنجیرەیەك شەڕ بە سەرکردایەتی ناپلیۆنی بەناو بانگ ڕویان دا کە ئامانج لێیان ڕوخاندنی زۆرێك لە دەسەڵاتەکان بو لە ئەوروپا. ناپلیۆن بە سوپاکەی تەواوی ئەوروپای داگیر کرد تا کار گەیشتە ئەوەی کە لەساڵی ١٨٤٠

خۆی کردە ئیمپراتۆری فەرەنسا و براکانیشی کردە شای وڵاتە ئەوروپییەکان: (جۆزێف) شای ناپۆلی، (لویس) شای هۆڵندا و (جیرۆم) شای لوسنفالیا (یەکێك لەو شانشینانەی کە سەر بە جێرمانیا بو). بەڵام ناتان پۆتشیڵد بە شێوەیەك کارەکەی ڕێك خست تا براکانی ببنە شای سەرمایە لە ئەوروپا و بەوشێوەیە ئەو کەسانە بونە دەسەڵاتی شاراوەی پشت ئەو دەسەڵاتەی کە ناپلیۆن دروستی کرد.

ئەو دەسەڵاتە شاراوەیە بڕیاری دا کە سویسرا هەڵبژێرێت و بیکاتە نیوەندێکی ئاسایش بۆ پارەکانیان. هەر بۆیە بڕیاریان دا کە ئەو وڵاتە دەر بکەن لە چوارچێوەی شەڕ و شۆڕەکان و بۆ هەتا هەتایە کردیانە وڵاتێکی بێ لایەن... دواتر خاوەن سەرمایە جیهانیەکان ڕویان کردە بازرگانییەکی نوێی پڕ قازانج کە ئەویش بازرگانی جەنگەکانە، ئەو بازرگانییەی لەهەر حاڵەتێك دا بێت قازانج ئەکات بەبێ ئەوەی نیگەرانی ئەوە بن کەکێ دەجەنگێت و کێ دەیباتەوە.. ئامرازیان بۆ ئەو کارە بریتی بو لە دەست گرتنیان بەسەر کاخانەکانی دروست کردنی چەك، تەقەمەنی، دروست کردنی کەشتی، مادەی کیمیایی، کانزا، کورەی ستیل و بەرهەم هێنانی دەرمان... پرۆژەی خاوەن سەرمایە جیهانیەکان بەباشی بەڕێوە ئەچو و بەلێشاو پاری ڕوی تێکردن لە دەرەنجامی پێش کەش کردنی کەرەستەکانی جەنگ کە دەیان دا بە لایەنە بەشەڕ هاتوەکان بەبێ جیاوازی. بەڵام ڕێگرێك دروست بو کە ناوی: ئیمپراتۆر ناپلیۆن پۆناپارت بو.. سەرەتا ناپلیۆن کێشەی نەبو لەگەڵ هاوپەیمانەکانیدا – خاوەن ئەو سەرمایە زۆرانەی کە قەرزیان ئەدایە بۆ پشتیوانی کردنی سوپاکەی و ئامادەکاری کردن بۆ هێرشەکان، بەڵام دواتر گومانێك دایگرت لە سروشتی ئەو کارانەی کە ئەو کەسانە ئەیان کرد و بە بیر تیژی خۆی درکی بەوە کرد کە شتێك لە پشت پەردەوە ڕو دەدات و لایەنگەلێك هەن کە ئەو کەسان لە پشت پەردەوە دەجولێنێت. هەر بۆیە بە وریاییەوە ئامادە کاری کرد و چاوەڕانی دەرفەتی ئەکرد بۆ لێدانی بازرگانەکانی جەنگ و شانە نوستوەکان بە شێوەیەکی کاریگەر دوای ئەوەی کە زانیاری و بەڵگەی تەواوەتی کۆ دەکاتەوە،

لەو کاتەوە نیەتەکانی بەرامبەر ئەو کەسانە بەدەرکەوت بەلام لە هەمان کاتدا سەرقالی شەڕی ڕوسیا بو بەو پێیەی کە چارەنوسی خۆی و سوپاکەی بەسترابۆوە بە دەرەنجامی ئەم شەڕەوە، لەو کاتەدا نورانیەکان بە گونجاویان زانی کە دەستی خۆیان بوەشێنن... ئەلبەتە شکست هێنانی سوپای ناپلیۆن لە هێرشەکەی ڕوسیا ڕێڕەوی ڕوداوەکانی گۆڕی...

بۆچونێك باوە دەلێت کە زستانی ڕوسیا و سەرماکەی هۆکار بو بۆ شکست دانی هێرشەکەی ناپلیۆن و کردیە گەورەترین کارەساتی سەربازی بەدرێژای مێژودا، بەلام لە ڕاستیدا هۆکاری شکستەکە بریتی بو لە تێکدانی هێلەکانی پەیوەندی بە نهێنی لە کاتێکدا کە تەقەمەنی دەدرا بەسوپای قەیسەر.

ئەو پلانەی کە هێزە شاراوەکان گرتیانە بەر بۆ تێك شکاندنی سوپای ناپلیۆن و ناچار کردنی بەوەی کەلە دەسەلات بێتە خوارەوە بوە پرۆگرامێك بۆ سەرانی پیلانگێڕی جیهانی کە لەگەشت جولانەوەکانیاندا دەیان گرتە بەر... ئەکرێت بەم شێوەیە باس لەو پرۆگرامەکە بکرێت: سەرچاوە نهێنیەکان دەچنە پۆستە سەرەکیەکانی پیشەسازی و پەیوەندی و خۆراك و گواستنەوە و چەندین نێوەندی هەستیاری دیکە. ئەو کاتە ئەو دەولەتەی کە ئەوان دەخزێنە ناوی دەکەوێتە ژێر ڕەحمەتی ئەوانەوە لەبەر ئەوەی شانە نهێنیەکان ئەو کاتە دێنە نێوەندەوە و دەتوانن نائارامیی دروست بکەن لە پشتیوانی کردنی سوپا و پەیوەندیەکانی و لەهەمان کاتدا نائارامی کۆمەلایەتی دروست بکەن لە کاتێکدا کە ولات لە شەڕ دایە: ئەو ڕەوشەش کە بەکار هات بۆ تێك شکاندنی سوپاکەی ناپلیۆن هەر هەمان ئەو ڕەوشە بو کە بەکار هات بۆ تێك شکاندنی سوپای ڕوسیای قەیسەری لەبەرامبەر یابان لە سالی ١٩٠٤ .

مێژو پێمان دەلێت کە چۆن دوای شکانی سوپاکەی ناپلیۆن ناچار بو کە دەست بەردای دەسەلات ببێت لە سالی ١٨١٥ و دورخاریەوە بۆ دورگەی (ئەلبا) و کاتێکیش کە لێی هەلهات و هەولی دا بگەڕێتەوە، ڕوبەڕوی ئەو هێزە شاراوانە بۆوە کە دەستیان گرتبو بەسەر ولاتدا، شەڕی واتەرلۆش کە دوای گەڕانەوەی ناپلیۆن بەرپاکرا، کۆتاییەکی یەکلا کەرەوە بو بۆ ناپلیۆن.

سەبارەت بە (ناتان ڕۆتشیڵد)یش، ئەتوانین بڵێین کە بە پێچەوانەوە بو لەبەر ئەوەی ئەو دەرفەتە وای کرد کە بە تەواوەتی دەست بگرێت بەسەر دارایی ئەوروپادا: ڕۆتشیڵد لە پایتەختی فەڕەنسا بارەگایەکی بۆ خۆی دانا کە بریتی بو لە کۆشکێك و ڕاستەوخۆ ئەیڕوانی بەسەر ئەو کۆشکەی کە لویسی هەژدەهەم تیایدا دەژیا و دەیتوانی بە ووردی چاودێری ئەو کۆشکە بکات. لە لایەکی دیکەوە هەوڵی دا تۆڕێك سیخوڕ دروست بکات تا زانیارییەکانی شەڕی واتەرلۆی بۆ بگوازێتەوە لە ڕێگەی کۆتری نامە بەرەوە... لە هەمان کاتدا تۆڕێکی دیکەی ڕێکخست تا زانیاری نادروست بگوازێتەوە لەسەر شەڕەکە بۆ ئینگلتەرا هەر لە ڕێگەی کۆتری نامە بەرەوە، بەم شێوەیە هەمو شتێك ئامادە بو کاتێك کە زانیاری پێدرا لەسەر سەرکەوتنی نزیکی (ولنگتۆن) سەرکردەی سوپای بەریتانیا بەسەر ناپلیۆن، هەر بۆیە دەست بە جێ فەرمانی دا بە نوێنەرەکانی کە پەیامی پێچەوانە بنێرن بۆ ئینگلتەرا بەو ناوەڕۆکەی کە جەخت لە سەرکەوتنی ناپلیۆن و شکانی سوپای بەریتانیا بکات...

بەم هەواڵە گەلی ئینگلیز ترسا و بازاڕی دراو هەرەسی هێنا بە شێوەیەك کە بەهای لیرەی ئیستەرلینی هاتە خوارەوە بۆ یەك (شلن)[٥٩]، لە هەمان کاتدا (ناتان ڕۆتشیڵد) بەڕێکەوت تا بەو پەڕی خێراییەوە بچێت بۆ ئینگلتەرا بە کەشتییەکی بچوك کە بە کرێی گرتبو تایبەت بەو کارە، هەر ئەوەندەی کە گەیشتە لەندەن فەرمانی بە هاوبەشەکانی کرد تا ئەوەندەی بۆیان ئەکرێت بکڕن و بەو شێوەیەش ئەوان کەوتە کڕینی هەر شتێك کە بکەوتایەتە بەر دەستیان وەك پشك و چەك و بەڵگەنامەی گرنگ و... هتد..

کاتێکیش کە دواجار هەواڵی ڕاستەقینە گەیشت لەسەر سەرکەوتنی (ولنگتۆن) و نرخەکان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان، سوخۆرە جیهانیەکان سودێکی ئەوتۆیان کۆ کردبۆوە کە لە خەیاڵیشدا نەدەگونجا.

---

(٥٩) هەر لیرەیەکی ئیستەرلینی بەرامبەر بە ٢٠ شلن.

کەس نازانێت کە چۆن ڕۆتشیڵد و سوخۆرە هاوکارەکانی توانیان خۆیان بپارێزن لە توڕەیی حکومەت و گەلی ئینگلتەرا بەهۆی ئەوەی کە بونە ماڵ وێرانکردنی هەزارەها کەس، بەڵام لە ڕوی مێژوییەوە زانراوە کە دامەزراوەی ڕۆتشیڵد قەرز گەلێکی دا بە ئینگلتەرا بە بەهای ١٨ ملیۆن لیرەی ئیستەرلینی و بڕی ٥ ملیۆن لیرەشی دا بە هاوپەشەکەی ڕوسیا لەسەر ئەو کارەی کە دژی ناپلیۆن کردیان، بەر لەوەش کە (ناتان ڕۆتشیڵد) کۆچی دوایی بکات لە ساڵی ١٨٣٦، کەسی یەکەم بو لە بانکی ئینگلتەرا و قەرزی نشتیمانی ئینگلیزیش گەیشتبوە ٨٨٥ ملیۆن لیرە ئیستەرلینی بە هۆی زیانە ئابورییەگەورەکە.

## چەند نیشانەیەك لەسەر ڕەوتی پیلانگێڕی لە سەردەمی ناپلیۆنەوە تا ئێستا

هەندێك جار زۆر بە دەگمەن ماسۆنییەك ئەدۆزرێتەوە لە نێوان هەزارەها ماسۆنی ئەوروپیدا کە شتێکی کەم بزانێت لەسەر هاتنە ناوەوەی ماسۆنیەتی ڕۆژهەڵاتی گەورە یاخود نورانی یا کەسە داناکانی زایۆنیزم بۆناو دڵی ماسۆنیەتی سەرەکی ئەوروپا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا گەورەکانی ماسۆنیەتی ئینگلیز ڕاستییەکە ئەزانن و ئەوش پاڵی پێوەنان تا ئینگلیزە ماسۆنیەکان ئاگادار بکەنەوە و لێیان قەدەغە بکەن کە پەیوەندی بکەن بەهەر کەسێك کە سەر بە کۆڕی ڕۆژهەڵاتی مەزن بێت یاخود بەهەر کەسێك کە سەر بەوان بێت، کەسێکی دیکەش بەوە ڕاستییەی زانی و ئەویش پاپا بیوسی نۆهەم بو، ئەو کەسەی کە ڕێگەی لە مەسیحیە کاسۆلیکەکان گرت کە پەیوەندی بکەن بە ماسۆنیەتەوە.

ئەگەر کەسێك گومانی هەبێت لە ڕاستی ئەو ڕۆڵەی کە ماسۆنیەت گێڕای لە شۆڕشی فەڕەنسا، ئەوا ئێمە ئاڕاستەی ئەکەین بۆ ئەو مشت و مڕەی کەولەو بارەوە کرا لە ئەنجومەنی نوێنەرانی فەڕەنسا لە ساڵی ١٩٠٤ و لێرەدا دەقی

کۆتایی ئەو مشت و مڕەتان بۆ ئەخەینە ڕو کە (دی روازانیت) ی توڕە کرد دوای ئەوەی کە هەندێك پرسیاری وروژاند بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕۆڵی ماسۆنیەت لە شۆڕشی فەڕەنسا و دواتر گوێی لە وەڵامەکان گرت.

دی روازانیت: کەواتە ئێمە هەمومان بەتەواوەتی و بەدیاری کراوی کۆکین لەسەر ئەم خاڵە، ئەویش ئەوەیە کە ماسۆنیەت تەنها دروست کەری شۆڕشی فەڕەنسا بوە، ئەو پاکتاوکردنانەش کە ئێستا ئەیبیستم لە ئەنجومەن ئەو دەردەخەن کە هەندێك کەسیش لێرە وەك من ئەوە ئەزانن.

ئەو کاتە (نجوملو)ی نوێنەر هەستا کە یەکێکە لە ئەندامانی کۆڕی ڕۆژهەڵاتی گەورەی فەڕەنسا و بەدەم خوراندنەوە وەڵامی دایەوە (ئێمە نەوەك هەر ئەوە نازانین... بەڵکو ئێمە ئەوەش بۆ هەموان ئاشکرا ئەکەین).

لەساڵی ١٩٢٣ نێوارە خوانێك ئامادەکرا لە پاریس و ژمارەیەك سیاسی و بەرپرس لە کۆمەڵەی گەلان تیایدا بەشدار بون کاتێك کە سەرۆکی کۆڕی ڕۆژهەڵاتی گەورە هەستا و پێکەکەی بەرز کردەوە و وتی: "بە خۆشی ڕژێمی کۆماری فەڕەنسا کوڕی ماسۆنیەتی فەڕەنسا... هەروەها بەخۆشی کۆماری سبەینێی جیهانی کوڕی ماسۆنیەتی جیهانی". بەم شێوەیە ئەبینین کە هێزەکانی پیلانگێڕی ئەو توانایەی هەبو لە ساڵی ١٩٢٣ و لە ژێر سایەی ڕژێمی کۆماری فەڕەنسا بە ئاشکرا شانازی بەوەوە بکات کە شۆڕشی فەڕەنسا زادەی ئەوە و بە ئاشکرا باس لە نیەتەکانی داهاتوی بکات وەك دامەزراندنی کۆماری جیهانی کە زادەی ماسۆنیەت دەبێت، ئەم حاڵەتەش زۆر سەیر نیە، لەبەر ئەوەی دەرەنجامی ئەو سەرکەوتنەیە کە نورانیەکان بەدەستیان هێنا لە پەیماننامەی ڤێرسای لە دەرەنجامی جەنگی جیهانی دووەم و بواری ڕەخساند بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بۆ ئەو دەسەڵاتە نهێنییەی کە دوابەدوای ڕژێمی پادشایەتی هات لە فەڕەنسا دوابەدوای شۆڕ و ڕوداوەکانی سەدەی نۆزدەهەم.

لە دوای ساڵی ١٩٢٣ ەوە هێزە شاراوەکانی فەڕەنسا ئەیتوانی پاڵ بە سەرچاوە و کەسە پەیوەندی دارەکان بە خۆیانەوە بنێت تا باشترین پێگە بەدەست بهێنن بچنە پێشەوە. هەر بەم شێوەیە بو کە لە ساڵی ١٩٢٤ و بۆ

یەکەمین جار نوێنەریان گەیاندە پۆستی سەرۆك وەزیران کە ئەویش مسیۆ (هریۆ)ی بەناو بانگ بو. ئەم کەسە لەو کاتەوە و لە تەواوی ئەو پۆستانەی کە هەیبوە تەواوی ئەو شتانەی جێ بەجێ کردوە کە لێی داواکاراوە، سەرپەرشتی هەڵمەتێکی کرد دژ بە ئاینی مەسیحی و داوای کرد کە ئاین جیا بکرێتەوە لە ژیانی گشتی... دواجار نۆبە هاتە سەر سپاردنی دەسەڵات بە جولەکەیەك:

یەکێك لە سەرکردەکانی کۆڕی ڕۆژهەڵاتی گەورە لەو کاتەدا سیاسەت مەداری فەرەنسی بەناوبانگ (لیون بلوم)بو، ئەویش هەروەك هەموان ئەزانن جولەکەیە و ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە ژیانی سیاسی فەرەنسا و بەردەوام بو تا دوای جەنگی جیهانی دووەم، چەند پۆستێکی وەزاری وەرگرت و دواتر لە ساڵی ١٩٣٦ و بۆ یەکەمین جار پۆستی سەرۆك وەیرانی بەدەست هێنا، لە نێوان هەردو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا کاری کرد لەسەر لەبەر چاوگرتنی کۆمەڵەی پیلانگێڕانی جیهانی بۆ دەست گرتن بەسەر (کۆمەڵەی نەتەوەکان) کە ئەو کاتە نێوەندەکەی لە شاری جنێف بو هەروەك چۆن ئێستاش کار بۆ ئەوە ئەکرێت کە دەست بگیرێت بەسەر نەتەوە یەکگرتوەکاندا، تا بتوانن سود لە ساریلکەیی تەواوی ئەو کەسان وەربگرن کە خەون بە تەنها دەوڵەتێکەوە دەبینن کە هەمو جیهان لەخۆ بگرێت لە ژێر سایەی حکومەتێك دا، بەو شێوەیەش بنەمای پەیوەندییان بە نیشتیمانەکەیانەوە لەدەست دەدەن و دەبنە نێچیرێکی ئاسان بۆ بۆچونەکانی پیلانگێڕی جیهانی.

لە دوای ساڵی ١٩٤٦ ەوە کۆمەڵەی پیلانگێڕی جیهانی دوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان دەستیان کرد بە خزینە ناو دەستەی نەتەوە یەکگرتوەکان بەئامانجی دەست گرتن بەسەریدا، لێرەدا شتێك هەیە کە نابێت پشت گوێی بخەین ئەویش بریتیە لە ڕەزامەندی نەتەوە یەکگرتوەکان لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل و بەخشینی فەڵەستین بە زایۆنیزمی سیاسی. لەو پێك هاتنەدا ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤێت بەشداریان کرد و بەو شێوەیە نەتەوە یەکگرتوەکان ئەو ئامانجەی بۆ زایۆنیزمی سیاسی هێنایە دی کە زیادتر لە نێو سەدەیە هەوڵی بۆ دەدات.

لەبەشی دووەمی ئەم كتێبەدا باس لەو ڕووداوانە ئەكەین كە هۆكار بون بۆ هەڵایسانی جەنگی جیهانی دووەم. ئەو هۆكارانەی كە پاڵی بە سوخۆرە جیهانیەكانەوە نا تا پشتیوانی پلانەكانی زایۆنیزمی جیهانی لە ئەستۆبگرن بە ڕەوشگەلی نهێنی و ئاشكرا تا ئەو كاتەی كە لە ساڵی ١٩٤٨ توانیان فەڵەستین داگیر بكەن. لێرە ئەوەندە بەسە كە ئاماژە بدەین بە سامانی كانزایی و نەوت كە بە هەزارەها ملیۆن دۆلار مەزەندە ئەكرێت، ئەو سامانەی كە پسپۆڕی بەریتانی نینگهام گریگ لە ساڵی ١٩٢٨ دۆزیەوە، ناوبراو كاری بۆ حكومەت ئەكرد لە ئەركێكی نهێنی دا، سەرجەم ئەو بەڵگە نامانەش كە پەیوەندی هەبو بەو دۆزینەوەیە لە دۆسێكانی حكومەتی بەریتانیا بەوردی شاردرایەوە و دواتر ئەو پسپۆڕە بۆ جاری دووەهەم لە كەنەداوە بانگكرایەوە بۆ فەڵەستین و ڕاستەوخۆ لەدوای جەنگی جیهانی دووەم لەوێ مایەوە تا لە ناكاو لە كەشێكی تەمو مژاوییدا ون بو بەبێ ئەوەی كەس لە بارەیەوە هیچ بزانێت، سامانی سروشتی فەلستین شتێك نیە جگەلە بەشێك لە سامانێكی مەزنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، سوخۆرە جیهانیەكان ئەوەیان لە پێش چاو گرتبو كە بە شێوەكەی خۆیان كە بریتی بو لە بڵاو كردنەوەی بێ سەرەو بەرەیی و هەڵ خەڵەتاندنی جەماوەرو دروست كردنی نائارامی و پشتیوانی كردنی بێ باوەڕی دەست بگرن بەسەر ئەو سامانەدا لە چوار چێوەی هەڵمەتێكی بەرفراوان بە ئامانجی لابردنی ئەو دەسەڵاتە ڕەوایانەی كە داكۆكی لەو سامانە دەكەن تا دەستی سوخۆرە جیهانیەكان پێی نەگات، ئەو سوخۆرانەی كە ئامانجیان گۆڕینی ئەو دەسەڵاتانەیە بە سیستەمگەلێكی بێ باوەڕی سەر بە خۆیان.

لێرەوە ئەو مەودا دوورودرێژەمان بۆ دەردەكەوێت كە پیلانگێڕی جیهانی بریتیە لە كاتی كەوتنی ناپلیۆنەوە.

# بەشی پێنجەم

## مێژوی شاراوەی بڵاو بونەوەی جولەکە لە ئەمەریکا

ئەگەر بچین بەدوای ڕوداوەکانی ژیانی ئەمەریکادا، بۆمان دەردەکەوێت کە بنەمای بڵاوبونەوەی جولەکە لە ئەمەریکا ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای مێژوی ئەمەریکا، سەرمایە دارە جولەکەکانیش دەستیان کرد بە بڵاو بونەوە لە ئەمەریکا تازە دروست بودا لەو کاتەوەی کە هێشتا نەببو بە دەوڵەت و لە سیانزە داگیرگەی بەریتانی پێك هاتبو.

هێدی هێدی بیرکردنەوەی سوخۆرە جیهانیەکان بەرەو داگیرگە ئەمەریکیەکان ئەڕۆیشت لەو کاتەوەی کە (بنیامین فرانکلین) پیاوی بە ناوبانگی دەوڵەتی ئەمەریکا گەیشتە لەندەن وەك نوێنەی داگیرگەکان، لەوێ سوخۆرە جیهانیەکان پێی گەیشتن، ئەوانەی کە هەر وەك پێشتر باسمان لێوە کرد دەستیان گرتبو بەسەر بانکی ئینگلتەرا و قەرزی نیشتیمانی بەریتانیادا.

لە پەڕی ٩٨، ژمارە ٢٣ ی بەڵگە نامەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکا، ڕاپۆرتێك دەدۆزینەوە کە لە لایەن (ڕۆبەرت ل. ئەوین)ەوە نوسراوە لە بارەی چاوپێکەوتنێکەوە کە لە نێوان هاوبەشەکانی ڕۆتشیڵد و بنیامین فرانکلین ئەنجام درابو، ڕۆبەرت ل. ئەوین ئەو کاتە سەرۆکی لیژنەی بانکەکان و دراو لە کۆنگرێسی ئەمەریکا بو، ئەو ڕاپۆرتە ئاماژە بەوە دەدات کە چۆن ئەو کەسانە پرسیاریان لە نوێنەرە ئەمەریکی کردبو لە باری بۆچونیەوە سەبارەت بە

هۆکاری گەشەسەندنی ئابوری لە داگیرە ئەمەریکیەکاندا.. فرانکلینیش بەم شێوەیە وەڵام ئەداتەوە: "کارەکە زۆر ئاسانە لەبەر ئەوەی ئێمە خۆمان دراوی خۆمان دەردەکەین... کاتێکیش کە ئەو کارە ئەکەین دەبێت بە شێوەیەك بێت کە بگونجێت لەگەڵ پێداویستی ئابوری پیشەسازی مان". ڕۆبێرت ل. ئەوین تێبینی ئەوە ئەکات کە ئەم وەڵامە سەرنجی کۆمەڵەی ڕۆتشیڵی ڕاکێشا بۆ ئەو دەرفەتەی کەلە بەر دەستیانە بۆ کردنی قازانجێکی زۆر... لەبەر ئەوەی تەنها پێویستیان بەوەیە یاسایەك دەربکەن کە ڕێگری بکات لەوەی کە داگیرگەکان خۆیان هەستن بە چاپ کردنی دراوی خۆیان و ناچار بکرێن بەوەی کە بگەڕێنەوە بۆ بانکی ئینگلتەرا بۆ ئەو کارە... تا ئەو کاتەش ئامیشیل مایەر ڕۆتشیلد لە ئەڵمانیا دادەنیشت و لەوێوە کارەکانی جێبەجێ ئەکرد و سەربازی پیشەگەری ئەڵمانی ئەدا بە بەریتانیا کەلە دیهاتەکان کۆیانی ئەکردنەوە بەشێوەیەك کە بۆ هەر سەربازێك بڕی ٨ لیرە ئیستەرلینی دیاری کرابو... هەر ئەم دەسەڵاتەشی بەس بو تا پاڵ بە حکومەتی بەریتانیاوە بنێت تا یاسایەك دەر بکات لەمەڕ دراوی ئەمەریکی.

دواجار ئەم یاسایە دەرچو و دەسەڵاتی داگیرکاری بەریتانی لە داگیر گەکانی ئەمەریکا هەستا بە دانانی بڕێك پارە بە دراوی ئەمەریکای پێشو لە بانکی ئینگلتەرا وەك گرەنتییەك بۆ ئەو قەرزەی کە بانك پێشکەشی داگیرگەکانی ئەکات بە بەهرە و بەدراوی نوێ. لێرەدا قسەکە بە جێ دەهێڵین بۆ بنیامین فرانکلین خۆی بەو پێ یەی کە وتەکانی لە بەڵگەنامەی کۆنگرێس ژمارە ٢٣ هاتوە:

"دۆخەکە تەنها دوای تێپەڕ بونی تەنها یەك ساڵ لە دەرچونی ئەو بڕیارە بە تەواوەتی پێچەوانە بوەوە، سەردەمی گەشە سەندن کۆتایی پێ هات و قەیرانێکی ئابوری جێگەی گرتەوە بەئەندازەیەك خراپ بو کە شەقامی داگیر گەکانی لێوان لێو کردبو لە بێ کار". ئەو بەڵگەنامەیە ئەڵێت: "بەڵام بانکەکانی ئینگلتەرا ئەوەیان ڕەت کردەوە کە زیادتر لە ڕێژەی ٥٠٪ بدەن لە بەهای ئەو دراوە ئەمەریکییەی کە پێیان درابو بە پێی یاسا نوێکە، ئەمەش ئەوە

ئەگەیەنێت کە بەهای دراوی ئەمەریکی تەنها بە نوسینی پێنوسێك بۆ نیوە کەم کرایەوە... ".

مێژوو نوس و لێکۆڵەرەکان هۆکاری سەرەکی شۆڕشی ئەمەریکا لە دژی ئینگلتەرا ئەگێڕنەوە بۆ باجی بەناوبانگی چا، بەڵام فرانکلین کە بە یەکێك لە سیما دیارەکانی ئەو شۆڕشە دادەنرێت، بەم شێوەیە هۆکاری شۆڕەشەکە شی ئەکاتەوە: وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا ئامادە بو بەو پەڕی سنگ فراوانیەوە کە ئەو باجە سادەیە قبوڵ بکات ئەگەر ئینگلتەرا مافی دەرکردنی دراوی لە وڵاتە یەککرتوەکانی ئەمەریکا وەرنەگرتایەتەوە، ئەم حاڵەتەش جۆرێك لە بێکاری و ناڕەزایەتی دروست کرد... وردە وردە ئەم ناڕەزایەتیە تەواری ویلایەتەکانی ئەمەریکای گرتەوە بەڵام کەسێك درکی بەوە نەکرد کە باجە زۆرە نوێ کان و بە تاڵان بردنی ئابوری دەرەنجامی چالاکی کۆمەڵێك چەتەی جیهانی بون کە لە هەمان کاتدا ئابوری بەریتانیاشی تاڵان ئەکرد، بەم شێوەیە شۆڕش تەقیەوە و یەکەمین بەر یەك کەوتن ڕویدا لە نێوان شۆڕشگێڕە ئەمەرکییەکان و هێزە ئینگلیزیەکان لە لنگستۆن لە ١٩ نیسانی ١٧٧٥. دواتر جۆرج واشنتۆن کرایە فەرماندەی هێزەکانی شۆڕش و کۆنگرێس و لە ٤ تەموزی ١٧٧٦ دا بەیان نامەی سەربەخۆیی ڕاگەیاند.

ململانێکان نزیك بە ٧ ساڵی خایاند و سوخۆرە جیهانیەکان بەڵێنیان دا کە پشتیوانی شەڕە داگیر کاریەکان بکەن کە تا ئەو کاتە دەرفەتێك بو لە ڕێگەیەوە کۆمەڵەی ڕۆتشیڵد توانی پارەی زۆر لە ڕێگەی دابین کردنی سەربازی پیشەگەر لە ویلایەتی (هس)ی ئەڵمانیەوە بۆ سوپای بەریتانیا دابین بکات. شەڕ کۆتایی هات بە خۆ بەدەستەوە دانی هێزەکانی فەرماندەی ئینگلیزی (جەنەڕاڵ کورنوالیس) و ڕێك کەوتن لەسەر پەیاننامەی پاریس، ئەو پەیمان نامەیەی کە

فرانكلين دانوستان كاری سەرەكی بو تيايدا و دان بەسەر بەخۆيی ولآتە يەكگترووەكانی ئەمەريكا نرا لە ٣ ئەيلولی ١٧٨٣[٦٠].

**دوای سەربەخۆيی:**

لەگەڵ ئەوەشدا كە جەنگ كۆتايی هات، بەڵام هێشتا سوخۆرە جيهانيەكان خۆيان نەدابو بەدەستەوە، بەڵكو هەوڵيان دا لە ڕێگەی نوێنەرەكانيانەوە ئەوەی لە تواناياندا هەبێت بيكەن تا ئەوە مسۆگەر بكەن كە لە دەستوری ئەمەريكادا هيچ بڕگەيەك نەبێت كە پەيوەندی بە دەركردنی دراوەوە هەبێت، ئەڵبەتە پاڵەوانانی سەربەخۆيی ئەمەريكا ئاگاداری ئەو مەترسيە بون و ورياى پلانەكانی سوخۆرەكان بون ئەمەش لەو مشت و مڕانەدا دەر دەكەوێت كەلە دۆسيێی كۆبونەوەكاندا هەڵگيراوە لە شاری فيلادلفيا لە ساڵی ١٧٨٧، ئەو كۆبونەوانەی كە ناسراوە بە (كۆبنەوەی ياوكانی دامەزراندنی ولآتە يەكگرتوەكانی ئەمەريكا). لەبڕگەی پێنجی بەشی هەشتەمی دەستوری ئەمەريكی دا بەم شێوەيە هاتوە دەڵێت:

"كۆنگرێس خاوەنی دەسەلآتە لە دەركردنی ئەو ياسا گەلانەی كە پەيوەندی هەيە بە ڕێك خستنی دراوەوە". دوای دەركردنی ئەم دەقە دەستوريیە، كارەكە لەدەست جولەكە جيهانيەكان دەرچو لەبەر ئەوەی لەو كاتەوە دەستور سروشتێكی پيرۆزی گرتە خۆ لە چاو ئەمەريكيەكان و ئيدی ئەوان نەيان دەتوانی بە ئاسانی و بەشێوەيەكی ڕاستەوخۆ بكەنە ئامانجەكانيان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستيان لە هەوڵ دان هەڵ نەگرت بەڵكو دەستيان دايە مانۆر كردن بۆ

---

([٦٠]) هەر دو دەوڵەت مەداری بەريتانی (لوزد شاثام)و كوڕەكەی(وليام بيت) هەست بە مەترسی سەرمايە دارە جولەكەكان ئەكەن هەر بۆيە بە شێوەيەكی ئاشكرا دەستيان كرد بە هێرش كردنە سەريان لەبەر چاوچنۆكيان لە سەربازگە ئەمەريكيەكاندا، (وليام بيت) سەرباری گەنج بونی توانی شا جۆرجی سێهەم ئاگادار بكاتەوە لە مەترسی سوخۆرە جيهانيەكان و ئاگاداری كردنەوە لە پيلانەكانيان كە ئامانج ليی هەلآيسانی جەنگەلە تەواوی ئەوروپا هەر بۆيە شا وەك سەرۆك وەزيران هەڵی بژارد بەلآم دواجار سوخۆرە جيهانيەكان توانيان كە ناچاری (وليام بيت) بكەن كە دەست لەكار بكێشێتەوە.

دەرکردنی یاسا گەلێك کە بە شێوەیەکی پێچەوانە پشتی دەبەست بەو یاسایە. ئەمەش ئەو دەقی یاسایانەی دراو دەردەخات کەلەو کاتەوە دەرچون لە کاتێك دا کە گەلی ئەمەریکی پێی وایە (لەو باوەڕەشدا دڵسۆزە) کە هەر یاسایەك دەر چوبێت لەگەڵ ڕۆحی ئەو دەستورەدا دێتەوە.

هیچ جێگەی گومان نیە کە لێکۆڵینەوە کردن لەسەر زاڵ بونی سوخۆرە جیهانیەکان بەسەر ئابوری ئەمەریکادا لە مێژوی جیهاندا خاوەن بایەخێکی گەورەیە و لێرەدا دێینە سەر باس کردنی.

ئەو ڕێڕەوەی کە سوخۆرە جیهانیەکان پەیڕەویان لێ ئەکرد، هەر هەمان ڕێڕەوی پێشتریان بو کەلە سەری ئەڕۆیشتن: ڕێڕەوی کۆمپانیای شاراوە، بە شێوەیەك کە بەڕێوەبەرەکانی بانکی ئینگلتەرا نوێنەرێکیان لە ئەمەریکا دامەزراند لە ساڵی ١٧٨٠ ەوە کەئەویش (ئەلکساندەر هامیلتۆن)، ئەو کەسەی کە بە هەڵمەتی ڕاگەیاندن ناوبانگی وەك سەرکردەیەکی نیشتیمانی ئازادیخواز دەرکرد. ئەم کەسە پێشنیاری دروست کردنی بانکێکی فیدراڵی کرد کە هەڵبستێت بە دەرکردنی دراو و سەرپەرشتی کردنی لەبری حکومەت بە شێوەیەك کە ئەو بانکە دامەزراوەیەکی تایبەت بێت کە موڵکایەتیەکەی بگەڕێتەوە بۆ بەرژەوەندییە تایبەتەکان واتە بۆ سەرمایەی تاکە کەسەکان... هەروەها هامیلتۆن پێشنیاری ئەوە ئەکات کە سەرمایە ئەو بانکە بکاتە ١٢ ملیۆن دۆلار، بانکی ئینگلتەرا لەو برە ١٠ ملیۆن دۆلار دەدات – بەدراوی سەردەم – و ئەوەش کە ئەمێنێتەوە ئەهێڵرێتەوە بۆ ئەمەرکیەکان.

ساڵی ١٧٨٣ هامیلتۆن و هاوبەشەکەی (روبێرت موریس) بانکی ئەمەریکایان ڕێك خست، مۆریس چاودێری دارایی کۆنگرێسی ئەمەریکی بو کە بەهۆی سەرپەرشتی ماڵی بەسەر خەرجیەکاندا توانی وا لە خەزێنەی ئەمەریکا بکات کەلە کاتی سەربەخۆییدا بکەوێتە حاڵەتی مایەپوچییەوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شێوازەکانی دەسەڵاتی شاراوە و بەکار هێنانەکانی جەنگ و سەرچاوەکان، مۆریس کاری زیادتری کرد لەوانە دەست گرتن بەسەر ئەو برە پارەیەی کە دەگەیشتە ٢٥٠ هەزار دۆلار لە ڕێگەی بەکار هێنانی وەك

سەرمایەی بانی ئەمەریکا.. لەبەر ئەوەی کە بەڕێوەبەرەکانی بانکی ئەمەریکا نوێنەری بانکی ئینگلتەرا بون – بێ گومان – و ئەمەش دەرەنجامی لۆجیکی چاوەڕوان کراو بو... بەم شێوەیە خاوەن سەرمایە جولەکەکان توانیان دەست بگرن بەسەر هەردو بانکەکەدا: بانکی ئینگلتەرا و بانکی ئەمەریکا.

ئەمە لە کاتێك دا بو کە سەرکردەکانی شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکا هەستیان بە مەترسی کرد و پێیان وابو کە زاڵ بونی بانکی ئینگلتەرا بەسەر بانکی ئەمەریکا دواجار ئەبێتەهۆی ئەوەی –لە کاتێکدا کە ئەگەر دارایی ئەمەریکا لە ژێر سەرپەرتی بانکی ئینگلتەرا بێت – کە دەست بگرێت بەسەر ئابوری ئەمەریکا، هەر بۆیە هەستان بە ناچار کردنی کۆنگرێس بەوەی کە ڕێگە نەدا کە بانکی ئەمەریکا هەستێت بەچاپ کردنی دراو.

سوخۆرە جیهانیەکان لەم شکستە کاتیە نائومێد نەبون بەڵکو هەستان بە دەرکردنی ڕێنمایی بۆ سەرچاوەکانیان تا هەوڵەکانیان بکەنە دو هێندە و چاوەڕوانی دەرفەت بکەن، بەم شێوەیە سەرکەوتو بون لەوەی (ئەلکسەندەر هامیلتۆن)ی نوێنەریان بگەیەننە پۆستی وەزیری دارایی ئەمەریکا و دواجار هەر لە ڕێگەی هامیلتۆنەوە توانیان کە ڕەزامەندی حکومەتی ئەمەریکا بەدەست بهێنن لەسەر ئەوەی کە ئەو مافە بدرێتە بانکی ئەمەریکا تا بە پشت بەستن بە قەرزە تایبەت و گشتی یەکان دراو دەربکات، ئەو پاساوەش کە هامیلتۆن پێشکەشی حکومەتی کرد ئەوە بو کە ئەو دراوەی کە کۆنگرێس دەری ئەکرد لەسەر بنەمای قەرزی نیشتیمانی بەبێ بەها بو لەدەرەوە لە کاتێك دا کە ئەو دراوەی کە لەسەر بنەمای قەرزی گشتی و تایبەت بو، گونجاو ئەبێت بۆ تێکڕای مامەڵە مالییە دەرەکییەکان و حەواڵە ئەکرێت. سەرمایەی نوێی بانکەکە بە بڕی ٣٥ ملیۆن دۆلار دیاری کرا کە ٢٨ ملیۆنی بەناوی سەرمایە گوزارە ئەوروپەیکانەوە بو، ئەو سەرمایە گوزرانەی کە سەر بە ڕۆتشیلد بون...

ئیدی کاتی ئەوە هاتبو کە پاداشتی ماندو بونەکانی هامیلتۆن بدرێتەوە، لە ڕاستیشدا پاداشتی خۆی وەرگرت... سوخۆرە جیهانیەکان پێیان وابو کە زیاد

لە پێویست ئەزانێت، شەڕێك لە نێوان ئەو و کەسێکی پێشەگەردا هەڵگیرسا کە ناوی (هاورن بور) و تیایدا هامیلتۆن گیانی لەدەس دا...

قۆناغی دووەم: ململانێ لەپێناو بالادەستی ئابوری:

قۆناغی پێشو بەو هەوڵ و مانۆڕانە کۆتایی پێ هات کە نرا لە پێناو سەرپەرشتی دەرکرنی دراوی ئەمەریکی، دوای ئەوەی کە بەربەستێکی نوێ سەری هەڵدا، سوخۆرە جیهانیەکان ڕوەو قۆناغی دواتر ڕۆیشتن کە بریتی بو لە: دەستگرتن بەسەر ئابوری ئەمەریکادا.

ئەم قۆناغە بە مانۆڕێکی بەرفراوان دەستی پێ کرد بە فەرمانی کۆمەڵەی ڕۆتشیلد بۆ نوێنەرە ئەمەریکیەکان کە خرابونە ڕیزی پێشەوەی ڕای گشتی تا هەڵمەتێکی پڕوپاگەندە دەست پێ بکەن کە مزگێنی قۆناغێکی پڕ لە خێر و خۆشی بات بۆ هەموان. هەروەها بەڕێوەبەری بانکە ئەمەریکیەکان بڕیاریان بۆ هات تا لە پێدانی قەرز و کەفالەت نامەکاندا پەل وپۆ بهاوێژن . بەم شێوەیە ئەمەریکیەکان دەستیان کرد بە سەرمایە گوزای کردن بە تەواوی توانایان لەو پڕۆژە نوێیانەی کە لە گشت شوێنێکدا هەڵتۆقیبو. کاتێکیش کە کار گەیشتە ئەم ئاستە، کۆمەڵەی ڕۆتشیلد فەرمانی نهێنی دەرکرد بەوەی کە قەرز نەدرێت و ئەو دراوەش کەم بکرێتەوە کەلە بازاردا مامەڵەی پێوە ئەکرێت و ئەمەش بوە هۆی دروست کردنی قەیرانێکی دارایی کە بوە هۆی هەرەس هێنانێکی ئابوری گەورە... لە کاتێکدا کە بانکی سوخۆرەکان پڕ بو لە قازانجی خەیاڵی و بەڵگەی موڵکداری و کەفالەت نامە.

ئەڵبەتە ئەم قەیرانە هەروا تێ نەپەڕی و بوە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە ئەمەریکیەکان ڕەخنە بگرن کە لە نێویاندا هەر سێ سەرکردە (جۆن ئادامز) و (تۆماس جیفرسۆن) و (ئاندرو جاکسن) بونیان هەبو کە دواتر دەبنە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا:

ئەوەی لە خوارەوە دێت چەند بڕگەیەکە لەو نامەیەی کە (جیفرسۆن) بۆ (ئادامزی) ناردوە:

"من باوەڕم بەوە هەیە کە ئەم دامەزراوە بانکیانە مەترسیان لە سەر ئازادیمان لەسوپای داگیرکەر زیادترە.. ئەم دامەزراوانە توانیویانە ئەرستۆکراتیەتێکی مالّی دروست بکەن کە ئێستا ڕووبەڕوی حکومەت دەبێتەوە. پێم وایە کە ئەبێت مافی دەرکردنی دراو لەو دامەزراوانە وەربگیرێتەوە و بدرێت بەو گەلەی کە مافی یەکەمی هەیە تیایدا".

ئەم ڕەخنە ئاشکرایانە ترسی لە لای سوخۆرە جیهانیەکان دروست کرد و وریای کردنەوە لەوەی کە بە بۆنەی نوێ کردنەوەی پشکی بانکی ئەمەریکا لە سالّی ١٨١١ دوچاری کێشە ئەبن هەر بۆیە ناتان ڕۆتشیلّد پەنای بردە بەر هەڕەشەکردن لە سەرۆکی ئەو کاتەی ئەمەریکا کە ئەندرە جاکسۆن بو و بەم شێوەیە ناوەڕۆکەکەی داڕشت:

"تەنها دو ڕێگە چارە هەیە، یا ئەوەتا ڕەزامەند ئەبن بە نوێ کردنەوەی خاوەندارێتی پشکەکە یاخود ڕەزامەند نابن، ئەو کاتە ولآتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا کاتێك خۆی ئەبینێتەوە کە دوچاری شەڕێکی ترسناك بوە".

پیلانگێڕانی هێزە خراپە هەمیشە ڕەوشی هەلّایسانی جەنگیان بەکار هێناوە لەدژی ئەو سەرکردانەی کە ڕوبەڕویان ئەوەستنەوە، بەلّام سەرۆك جاکسۆن گوێی بەو هەڕەشەیە نەدا کەلە بنەمادا باوەڕی پێی نەبو و بەم شێوەیە وەلّامی شاندی سوخۆرە جیهانیەکانی دایەوە: "ئێوە هیچ نین جگە لە کۆمەلێك دز و مار و من کار ئەکەم لەسەر تێك شکاندنتان بەلّکو سوێند ئەخۆم لەسەر ئەوەی تێکتان بشکێنم".

لەو کاتەدا سوخۆرە جیهانیەکان بڕیاریان دا کە هەڕەشەکەیان بکەنە ڕاست و هەر بەڕاستیش حکومەتی بەریتانیا – لەلایەن بانکی ئینگلتەراوە هان درابو – لە سالّی ١٨١٢ جەنگی هەلّگیرساند کە تەنها ئامانج (ناتان ڕۆتشیلّد) لەو شەڕە مایە پوچ کردنی خزێنەی ئەمەریکا بو بەهۆی تێچوەکان شەڕ تاوای لێ بێت کە هیچ جۆرە چارەیەکی نەبێت جگە لە وەرگرتنی قەرز لەدەرەوە.

قوربانی وێرانکارییەکان لە فەرهەنگی لێکدانەوەکانی ڕۆتشیڵدا نەبو، دواجار ئەم پلانە بە شێوەیەکی تەواودتی سەری گرت و کۆنگرێس لە ساڵی ١٨١٦ بڕیاری دا لەسەر نوێکردنەوەی مافی پشکی بانکی ئەمەریکا.

# شەڕی ناوخۆیی ئەمەریکا
# ١٨٦٦-١٨٦١

شەڕی ناوخۆیی ئەمەریکا بە گرنگ ترین ڕوداوی مێژوی ئەمەریکا دادەنرێت، لێرەدا بوار نیە بۆ باس کردن لەو شەڕە بەناوبانگە لەگەڵ ئەوەشدا کتێبێکی مێژو نیە کەباس لەو ڕوداوە نەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێك هەیە لەسەر ئەو شەڕە کە ڕای گشتی بێ ئاگایە لێی ئەویش ئەو ڕۆڵەیە کە سوخۆرە جیهانیەکان بینیان تیایدا و ئەو دەرەنجامانەشە کە بەدەستیان هێنا، لێرەدا باس لە وردە کاری هەندێك لەو ڕوداوە نادیارانە ئەکەین کە هاوکات بون لەگەڵ شەڕەکەدا.

لە ساڵی ١٨٥٧ گرێ بەستی هاوسەر گیری بەسترا لە لەندەن لەنێوان (لیونورا) کچی ئەمینداری بەشی ئینگلیزی خانەوادەی ڕۆتشیڵد و هولونیك لەگەڵ خزمێکیان بە ناوی ئەلفۆنسۆ ڕۆتشیڵد کە ئەندامی خانەوادەی ڕۆتشیڵد بو لە فەڕەنسا، ئاهەنگی ئەو هاوسەر گیرییە دەرفەتێکی باش بو لە لەندەن کە بوە هۆی کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خاوەن سەرمایە و سیاسیە جیهانیەکان. لەنێوانیانیش دا کەسێك هەبو بەناوی "دزرائیلی" کە سیاسیەکی جولەکەی بەناو بانگ بو دواتر بوە سەرۆك وەزیرانی ئینگلتەرا بۆ چەند جارێك – سەرباری ئەوەی کە جولەکە بو – ئەڵبەتە جگەلەوەی کە بەناوبانگترین پیاوی دەوڵەتی ئینگلیز بو لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

لێرەدا چەند وتەیەکی دزرائیلی ئەهێنینەوە کەلەو ئاهەنگەدا وتویەتی: "لە ژێر ئەم بنمیچەدا سەرانی خانەوادەی ڕۆتشیڵد کۆدەبنەوە کە ناوبانگیان تەواوی ئەوروپا و جیهانی گرتۆتەوە"، دواتر ڕو لە بەرپرسانی خانەوادەی

ڕۆتشیلد ئەکات لە پاریس و لەندەن و دەڵێت:"ئەگەر بتانەوێت، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا دابەش بکەین بەسەر دو بەشدا، بەشێکیان ئەدەین بە جینس (سەرۆکی بەشی فەڕەنسا) و ئەوی دیکەشیان ئەدەین بە لیوفیل... سەبارەت بە ناپلیۆن پۆناپارتی سێهەمیش – ئیمپراتۆری ئەو کاتەی فەڕەنسا –هەر ئەوە ئەکات کە من پێی ئەڵێم، ئەو پلانەی کە بۆمان داناوە ئەوەندە قورسە کە وای لێ ئەکات بە تەواوەتی سەر قاڵ بێت".

مێژو بۆمان ڕون ئەکاتەوە کە چۆن بنەماڵەی ڕۆتشیلد دواتر کەسێکیان بەناوی فیامین – یەکێکە لە ناسیاوەکانیان – دانا وەك نوێنەریان لە ئەمەریکا و چۆن ڕوداوەکان یەك بەدوای یەکدا هاتن تا ئەو کاتەی کە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا و بوە ڕاستی.

سوخۆرەکان تەواو ئەو پلانەیان جێ بەجێ کرد کە دزرائیلی ئاماژەی بە ڕێگەکانی دابو، هەر بۆیە هەستا بە ڕازی کردنی ناپلیۆن پۆناپارتی سێهەم تا مەکسیك بگرێت و بیخاتە سەر ئیمپراۆریەتەکەی وەك گرەنتییەك بۆ سەر قاڵی و بێ دەنگ بونی، حکومەتی بەڕەیتانیاش ڕازی بو بە دوبارە داگیر کردنەوەی ویلایەتەکانی باکوری ئەمەریکا وەك دەرەنجامێکی شەڕەکان. ئامانجی سەرانی جولەکە دولایەنە بو لەو شەڕەدا: سەرەتا دەرفەتێکی زێڕینیان ئەخاتە بەردەم بۆ پێشکەش کردنی قەرز و فرۆشتنی چەك بە سوی زۆر بە ناپلیۆن بۆ شەڕەکەی لەگەڵ مەکسیك و هێزەکانی ویلایەتی باشور، ئامانجی دووەمیش کە هیوای پێی بو بریتی بو لە دوبارە داگیر کردنەوەی ویلایەتەکانی باکور لە لایەن بەڕیتانیاوە و بەو شێوەیەش ئەو ویلایەتانە ئەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆیانەوە، جگەلەوە ئەوان ئەیانویست کە ئەو ویلایەتانە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆیانەوە هەروەها دەیانویست کە ئەو شەڕە ببێتە بەربەستێك لەبەردەم سەرۆکی مەزن (لینکۆڵن) تا کۆیلەکان ئازاد نەکات لە ئەمەریکا، بەو پێیەی کە ئەیانزانی کە بەردەوام بونی کۆیلایەتی ئەبێتە هۆی لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی یەکجارەکی نەتەوەی ئەمەریکا... سەرۆك لینکۆڵن بەوەی دەزانی و هەر ئەوەش بو کە پاڵی پێوە نا تا بڵێت:"هیچ نەتەوەیەك

ناتوانێت زۆر بژی ئەگەر نیوەی هاوڵاتیەکانی ئازاد بن و نیوەکەی تریشی کۆیلەبن".. شەڕەکە بەو شێوەیە بەڕێوە نەچو کە سوخۆرەکان دەیانویست لەبەر ئەوەی هێزەکانی باشور بۆخیان پێویستیان بە هاوکاری بو. هەر بۆیە سوخۆرەکان ڕویان لە ناپلیۆنی سێهەم کرد بە ئامانجی ئەوەی کە بێتە شەڕەکەوە و لە بەرامبەریشدا بەڵێنی ئەوەیان پێدا کە هەردو ویلایەتی (لویتریانا) و (تەکساس)ی پێ بدەن، بەڵام ڕێگرێکی چاوەڕوان نەکرا لە بەردەمیاندا دروست بو ئەویش قەیسەڕی ڕوسیا بو کە هەواڵی ئەو هەوڵانەی پێ گەیشتبو بۆیە هۆشدارییەکی ئاڕاستەی هەردو حکومەتی فەڕەنسا و ئینگلیز کرد و پێی ڕاگەیاندن کە هێرش کردنە سەر ویلایەتەکانی باکوری ئەمەریکا وەك هێرش کردنە سەر ڕوسیا یە، بۆ جەخت کردنەوەش لەسەر هوشدارییەکەی ژمارەیەك لە کەشتیە ڕوسیەکانی ناردە کەنارەکانی ویلایەتەکانی باکور (نیۆیۆرك و سان فرانسیسکۆ) و خستیە ژێر فەرماندەیی لینکۆڵنەوە. بەم شێوەیە پیلانگێڕەکان شکستیان خوارد شەڕەکە تەنها لەنێو ئەمەریکیەکاندا مایەوە و بە سەرکەوتنی باکوریەکان کۆتایی پێ هات بەسەر باشورییەکاندا.

## جوڵەی سەرمایە و کوژرانی لینکۆڵن:

بەبونی لێنکۆڵن شەڕی سوخۆرە جیهانیەکان چوە ئاستێکی دیکەوە بە شێوەیەك کە سەرۆك لینکۆڵن ڕوبەڕویان وەستا و لە ویلایەتەکانی باکور کەوتە تێك شکاندنی ئەو کۆتانەی کە ئابوری ئەمەریکایان پێ بەند کردبو، بۆ ئەو ئامانجە کەوتە جێ بەجێ کردنی دەستوری ئەمەریکا بە پشت بە ستن بە برگەی ٥ لە بەشی هەشتەم لە مادەی یەکەم، کە پێی ئەو یاسایە کۆنگرێس مافی دەرکردنی دراو ئەدات و بەو پێیەش ٤٥٠ ملیۆن دۆلاری فەرمی دەرکرا بە بەهانەی قەرزی نیشتیمانی.

ئەو کاتە سوخۆرە جیهانیەکان تەواوی هێزیان کۆکردەوە بۆ ڕوبەڕو بونەوەی لینکۆڵن کە ئیدی ببوە مەترسیەك بۆیان هەر بۆیە دەستیان کرد بە زنجیرەیەك مانۆر و پیلانیان دانا بۆ کەمکردنەوەی بەهای دراوی نوێو و لەناو بردنی (لینکۆڵن)، گەیشتنە ئامانجی یەکەم لە ڕێگەی دەرکردنی یاسایەك لە کۆنگرێسی ئەمەریکا لە لایەك بە ڕێگری کردن لە دانەوەی سودی قەرزی نیشتیمانی یاخود بەهای ئەو کاڵایانەی کە بەو دراوە هێنراوە و لە لایەکی دیکەشەوە لە ڕێگەی بەرپا کردنی شەڕێکی گەورە لە بانك و بازاڕەکانی دراودا... بەم شێوەیە بەهای دراوەکە زۆر دابەزی و گەیشتە یەك لە سەر سێ بەها ڕاستەقینەکەی... کاتێکیش کە گەیشتنە ئەم ئاستە هەستان بە کڕینەوەی تەواوی دراوەکە تا مامەڵەی پێوە نەکرێت و بە دراوەکە هەستان بە کڕینی تەواوی سەنەدەکانی حکومەت بە بەهای ڕاستەقینەی دۆلار. بەو شێوەیەش بە تیرێك دو نیشانیان شکاند، لە لایەك بونە هۆی ئەوەی کە داڕمانی بەهای دۆلار و لە لایەکی دیکەش سودێکی زۆریان برد. لێرەدا چەند بڕگەیەك ئەهێنینەوە لەو نامەیەی کە وەك ڕێنمایی خاوەن سەرمایەکانی ئەوروپا ئاڕاستەی دامەزراوە بانکیەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا کرا.

"ئێمە ناتوانین ڕێگە بدەین بە مامەڵە کردن بە دراوی نوێی ئەمەریکا تەنها ئەو کاتە نەبێت کە بکەوێتە ژێر چاودێری خۆمانەوە، ئێمە ئەتوانین بگەینە ئەو ئامانجە لە ڕێگەی دەست گرتن بەسەر سەنەدەکانی قەرزی نیشتیمانی کە ئەو کارە ئەتوانێت دەست گرتن بەسەر دراو حکومەت دا مسۆگەر بکات. سوخۆرەکان لە شەڕدا لەم ئاستەدا نەوەستان بەڵکو کەوتنە پشتیوانی کردنی دارایی چەند نوێنەرێك و بەم شێوەیە توانیان کە کۆنگرێس ناچار بکەن کە دەنگ دانی گشتی ئەنجام بدات لە ساڵی ١٨٦٣ لەسەر یاسای ئەو بانکانەی کە دانرابون لە بەرژەوەندی ئەوان سەرباری دژایەتی کردنی زۆری ئەو بڕیارە لە لایەن لینکۆڵنەوە و بەمەش توانیان سەرکەوتنێکی دیکە بەدەست بهێنن بەسەر ئابوری ئەمەریکادا.

لێرەدا چەند بڕگەیەك ئەهێنینەوە لەو نامەیەی کە دامەزراوەی ڕۆتشیڵد و براکانی بۆ کاری بانکداری لە لەندەن لە بەرواری ٢٥ حوزەیرانی ١٨٦٣ دا ئاڕاستەی یەکێك لە دامەزراوە داراییە گەورەکانیان کرد لە شەقامی (وۆڵ ستریت)ی بەناو بانگ، کە بارەگای دامەزراوە گەورەکانی نیویۆرکە تا ئەم سەردەمەمان کە ئەویش دامەزراوەی (نیکلهایمو) و (مۆرتۆن) و (فاندەر گۆڵد)[٦١]ە:

بە ڕێزان:

بە ڕێز (جۆن شێرمان) لە ویلایەتی ئۆهایۆ لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا نامەیەکی بۆ نوسیوین و بۆچونی خۆی پێ ڕاگەیاندوین لەسەر ئەو قازانجانەی کە ئەکرێت بە دەست بهێنرێت لە دەرەنجامی ئەو بڕیارەی کە گۆنگرێس دەری کردوە لە بارەی بانکەکانەوە... بەڕێز شێرمان ئەڵێت ئەم دەرفەتێکە کە پێشتر بۆ سەرمایە دارە جیهانیەکان نەڕەخساوە بۆ کۆکردنەوەی پارە.. دیارە کە ئەم یاسایە ئەو دەرفەتە ئەڕەخسێنێت بۆ بانکی ئەوروپا کە بە تەواوەتی دەست بگرێت بەسەر ئابوری ئەمەریکادا.

دواتر ڕۆتشیڵد لە نامەکەی دا بۆچونی خۆی دەڵێت:

"کەمن ئەوانەی کە دەزانن ڕژێمی نوێی بانکی ئەیانخاتە سەر دوڕیانێك: یا ئەوەتا دەبێت پەیڕەویمان لێ بکەن تا هەندێك قازانج بکەن، یاخود دەبێت چاوەڕوانی بەروبومەکەی بکەن... بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە هەر دژایەتی کردنێك کەلە لایەن ئەو کەسانەوە بگیرێتە بەر بێ دەرەنجام ئەبێت، بەڵام تێکڕای گەل ئەتوانین بڵێن کە لە ڕوی فکرییەوە ناتوانن درك بەو سودە بکەن کە ئەگات بە سەرمایەی جیهانی لەدەرەنجامی ئەم ڕژێمە، هیچ جۆرە گومانێکیش لە لایان دروست نابێت لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕژێمە لە سودی ئەوانە".

*دڵسۆزەکان*

*ڕۆتشیڵد و براکانی*

---

([٦١]) ئەم سێ کەسە لە گەورە بانکدارەکانی جیهانن.

ئەمەی خوارەوەش دەقی وەڵامی ئەو نامەیەیە کە نیکلهایمۆ و مۆرتۆن و ڤاندرگۆلد ناردیان بۆ ڕۆتشیلد و براکانی:

بەڕێزان:

نامەکەی ئێوەمان پێ گەیشت.. هەر وەك دیارە بەڕێز جۆن شیرمان خاوەن خەسڵەتی ئەو سەرمایە دارە جیهانییە سەرکەوتوانەیە بە شێوەیەك کە هیچ بەهایەك نادات بەو هەست و سۆزانەی کە بەدوری ئەخەنەوە لە ئامانجە گەورەکان، سەرباری ئەوە ئەو گەنجێکی بیرتیژ و خاوەن خەونە، ئامانجی ئەوەیە کە ببێتە سەرۆك کۆماری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا... ئەوەتا لەو کاتەوە ئەندام کۆنگرێسە. بیرکردنەوەی دروست پاڵی پێوەنا لەوە بکات کە قازانجی گەورە بە ڕاگرتنی هاوپێیەتی دێت لەگەڵ ئەو کەس و دامەزراوانەی کە خاوەن سەرچاوە و داراییەکی زۆرن.. ئەوان تەنها پشت بە ڕەوش گەلی ئاسایی نابەستن... ئەگەر پێویستی کرد یا پشتیوانی حکومەت بەدەست دەهێنن یاخود سزای ئەو کەسانە دەدەن کە ڕوبەڕوی بەرژەوەندییەکانیان دەبنەوە..".

دواتر قسە دێتە سەر ژماردنی برگەکانی یاسای بانکداری نوێ و ئەو سودانەی کە لێوەی بەدەست دێت.. دواتر نامەکە بە پوختەیە کۆتایی پێ دێت:

"بانکەکان مافی زیاد کردن یاخود کەم کردنی ئەو دراوەی بەخشێوە کە مامەڵەی پێوە ئەکرێت، هەروەها مافی پێدانی قەرز و کێشانەوەی داوە، بەو پێیەش کە بانکەکان خاوەن ڕێکخراوێکی گشتین کەواتە ئەتوانێت لە چوارچێوەی سیاسەتێکدا جوڵە بکات و بازاڕی دراو بەو شێوەیە لێ بکات کە خۆی ئەیەوێت بۆنمونە ئەتوانێت ببێتە هۆکار بۆ هاتنە خوارەوەی تەواوی بەرهەمی وڵات لە ماوەی یەك هەفتە و تەنانەت یەك ڕۆژدا.. . جگەلەوە کە بانکەکان بەخشراون لە دانی باج لەسەر سەنەد و سەرمایەکانیان.. ئێمە دڵنیاین کە ئەم نامەیە وەك نامەیەکی تایبەت هەڵ ئەسەنگێنن کە بە شێوەیەکی یەکلا کەرەوە نوسراوە.

*ئەو پەڕی ڕێزی دڵسۆزتان*

*نیکلهایمو، مۆرتۆن و ڤاندە گۆلد*

ئەم دو نامەیە پێویستی بە تێبینی نیە لەسەری، لێرەدا هەر ئەوەندە بەسە بڵێین کە بانکەکان لەدەرەنجام ئەم یاسایە بونە لایەنی زاڵ بەسەر ئابوری ئەمەرکیاوە نەوەك حکومەت، بانکەکانیش بە مانای دامەزاوەری دارایی دێت، کاتێك کە رسوماتی نیشتیمانی بەهێز نییە و دەوڵەتیش پشت بە داهاتێکی گەورەی جێگیر دەبەستێت، بەمانانی خاوەن سەرمایە جیهانیەکان دێت کە دەستیان گرتوە بەسەر زۆرینەی دامەزراوەی ماڵی و بانکە جیهانیەکاندا.

بەڵام سەرۆك لینکۆڵن هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەم نەما جگەلەوەی کە هوشدارییەکی ئاشکرا ئاڕاستەی گەلەکەی بکات، ئەم ڕێگەیەی گرتە بەر لەبەر ئەوەی پێی وابو کە گەلی ئەمەریکا ئەمجار گوێ لەدەنگی هزری دەگرێت. هەر بۆیە هێرشێکی ئاشکراو توندی کردە سەر سوخۆرە جیهانیەکان، لەو هێرشەدا دەڵێت:

"من لە ئاسۆدا دەبینم کە نەتەوەیەك هێدی هێدی نزیك ئەبێتەوە.. ئەم نەتەوەیە سەرنج ڕائەکێشێت و وام لێ ئەکات کە بلەرزم لەترسی ئەوەی کە نەوەك شتێکی خراپ ڕوبەڕوی وڵاتەکەم ببێتەوە، ئێستا بەرتیل بۆتە ڕێگەیەکی باو دەبێتە هۆی ئەوەی کە دواتر گەندەڵی بگاتە بەرزترین ئاستەکان، هەروەها سامانی وڵات بە تەواوەتی ئەکەوێت ژێر دەسەڵاتی ژمارەیەکی کەم کە هیچ لاری نابێت لە وێران کردنی کۆمارەکە و دواجار... ".

لێنکۆڵن ئەو کاتە لە کۆتایی ماوەی سەرۆکایەتیەکەی بو بەڵام هەڵبژاردنە نوێکە وای لێکرد کە دوبارە ببێتەوە بەسەرۆك و ئەم جارە نیەتی وابو کە یاسایەك دەر بکات بۆ لەناو بردنی سوخۆرە جیهانیەکان، هەر بۆیە ئەوانیش کەوتنە خۆیان تا بەر لە مەترسیەکە بگرن.. دەرەنجام لە ١٤ نیسانی ١٨٦٥ لەناو شانۆگەرییەك و لەلایەن کەسێکی جولەکەوە تیرۆر کرا کە ناوی (جۆن ویلکز بوکس) بو.. زۆرێك لە ئەمەریکیەکان هۆکاری پشتی ئەم تیرۆر کردنە نازانن و کتێبەکانی مێژو هیچ ڕونکردنەوەیەك لەو بارەوە نادەن سەرباری ئەوەی کە لێکۆڵەرەکانی ئەوکاتە چەند نامەیەکیان دۆزیبۆوە لە جانتای کەسی

بکوژدا کە بە کۆد نوسراو و دواتر کلیلی ئەو کۆدەیان دۆزیەوە کە لە لای یەهوزا ب. بنیامین بو کە بە سەرچاوەی یەکەمی ڕۆتشیلد دادەنرا لە ئەمەریکا، پێویستە ئەوەش بوترێت کە ئەم نامەیە هیچ ئاماژەیەکی تێدا نیە بۆ ئەو تاوانە بەلام لەگەلّ ئەوەشدا بەلگەیەکی حاشا هەلنەگرە لەسەر بونی پەیوەندی لە نێوان (بوس) بکوژ و سوخۆرە جیهانیەکان، بەم شێوەیە دوبارە سوخۆرەکان لە ژێر پەردەوە ئیشیان کرد لە کاتێکدا کە ئۆبالّی تاوانەکە خرایە پالّ بکوژێکی ئاسایی.

لە دوای تیرۆر کردنی لینکۆلن بەر بەستێکی گەورە هەلگیرا لەسەر ڕێگەی سوخۆرە جیهانیەکان و ڕێگە کرایەوە بۆ دەستگرتن بەسەر بەسەر ئابوری ولاتە یەکگترەوەکانی ئەمەریکا .

# مانۆره ماڵیەکان

## کورتەیەکی ئەو حاڵەتە لە سەردەمی لینکۆڵنەوە
## تا جەنگی جیهانی دووەم

هەر وەك پێشتر باسمات لێوەکرد بە مردنی لینکۆڵن بەربەستێکی گەورە لەبەردەم ڕێگەی سوخۆرە جیهانیەکان هەڵگیرا، بەڵام بەربەستێکی دیکەی گەورە لە بوارێکی دیکەدا هەر مابو کەئەویش بواری دراو بو:

سیستەمی دراو و دارایی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لەسەر بنەمای کانزای زیو دەمەزرابو بە پێچەوانەی سیستەمی ئەوروپی - ئینگلیزی کە ئەو کاتە و ئێستاشی لەگەڵ دابێت لەسەر بنەمای ئاڵتون دامەزراوە و هۆکارەکەشی زۆر سروشتییە، لەبەر ئەوەی ویلایەتەکان ڕێژەیەکی زۆر زیو و ڕێژەیەکی کەم ئاڵتونیان هەبو بە پێچەوانەی ئەوروپا و بەریتانیاوە. ئەمە ڕێگرێکی ئاسان نەدەهاتە بەرچاو لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی سروشتی هۆکار بو تا وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بتوانێت سەربەخۆیی دارایی خۆی بپارێزێت بەبێ ئەوەی کە کاریگەر بێت بە گۆڕانارییەکانی دراوی ئەوروپا و جیهان و بەدور بن لە کۆنتڕۆڵکردنی ئابورییەکەیان لەلایەن سوخۆرە جیهانیەکانەوە. لەبەر ئەوە کەوتنە خۆ تا دۆخەکە بگۆڕن.

سوخۆرەکان نوێنەرێکی خۆیان نارد بۆ ئەمەریکا (ئەرنست مايد) و نیو ملیۆن دۆلاریان بە دراوی سەردەم خستە ژێر دەستی تا وەك بەرتیل بیبەخشێت بە پێی پێویستی پرۆژەکەیان، بەو شێوەیە زنجیرەیەك پرسەی کڕینی ویژدان دەستی پێکرد تا ئەو کاتەی کە سوخۆرەکان توانیان کە پرۆژە

یاسایە بخەنە بەردەست کۆنگرێس، ئەو کەسەی کە پێشنیاری کرد سیناتۆر جۆرن شیرمان بو[٦٢] و لە ساڵی ١٨٧٣ ئەو یاسایە بە هەوڵی ئەو دەرکرا:

(یاسا چاك كردنی دراوی كانزایی) هەر لە سەرەتادا چەند شتێكی لە خۆ گرتبو كە سەرنجی ڕادەكێشا، وا دەهاتە پێش چاو كە شتێك نیەجگە لە ئامانجێك بۆ چاكسازی كردن لە سنورێكی دیاری كراودا، لە كاتێكدا كە ئەم یاسایە لەناواخنیا ژەهراوی بو. شانەكانی پیلانگێری لە لایەكی دیكەوە كاریان كردبو تا توانیان سەركەوتن بەدەست بهێنن لە گەیاندنی ئارنست مايد بۆ پۆستی ڕاوێژكاری دارایی حكومەتی ئەمەریكا... بێگومان مايد بە پێی بڕیارەكانی كۆمەڵەی ڕۆتشیلد كاری ئەكرد و پرۆسەی كێشانەوەی دراوی زیو لە مامەڵە پێوە كردن دەستی پێكرد لە ژێر سەرپەرشتی دەستەیەكی دارایی، ئەمەش بوە هۆی دروستا كردنی قەیرانێكی ئابوری كە كۆنگرێسی لە ساڵی ١٨٧٩ ناچار كرد كە گوژمێكی دیكە لە دراوی زیوین بخاتە ناو بازاڕەوە و توانی ئەم قەیرانە دەست كردە بۆ ماوەیەكی كورت ڕابگرێت، لە كاتێكدا كە بانكەكان ڕێنمایی نوێیان لەو بارەوە بەدەست گەیشتبو لەسەر قۆرخكاری ڕۆتشیلد لە ئەوروپادا، كۆمەڵەی ڕۆتشیلدیش ئامۆژگاری و ڕێنوێنیەكانی دابو بە یەكێتی بانكەكانی ئەمەریكا كە وەك نێوەندگیرێك كاری ئەكرد لە نێوان ڕۆتشیلد و تێكڕای بانكەكان، ڕێنوێنیەكانیش ئەوەی لە خۆ گرتبو كە پێویستە سەنەدی نوێ دەر بكرێت بە بەپشتیوانی ئاڵتون بە شێوەیەك كە بەهاكەی دەگەیشتە ملیارێك دۆلار و قەرزەكانیش لەسەر بنەمای سەنەد دران، لە هەمان ئەو كاتەی كە بانكەكان بە مەبەست كاریان كرد لەسەر كێشانەوەی ئەو دراوانەی كە پشت بەستوبو بە زیو لە مامەڵە كردن دا سەرباری كاغەزە دراوییەكانی دیكە. پسپۆڕەكانی ڕۆتشیلد وا هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەم پرۆسەیە كرد كە دەتوانێت ترسێكی زۆر دروست بكات لە ژیانی ئابوری ئەمەریكا دا بە

---

([٦٢]) زانیاری تەواو لەسەر لایەنە شاراوەكانی ئەو یاسا و پیلانگێرییەی كە كرا بۆ دەركردنی بە دوورودرێژە لە كتێبی (تەواوی وردەكارییەكانی پیلانگێری یەدەگی فیدراڵی) كە لە لایەن نوسەری ئەمەریكی (نوستامی مولینز) لەساڵی ١٩٥٤ دا نوسرا.

شێوەیەك كە لە كاغەزە بەهادارەكان هیچ نامێنێتەوە جگە لەوانەی كە لەو بانكانەوە دەرچووە كە پشتیوانەیەكی ئاڵتونی هەیە، لە ڕاستیدا ئەو ترسە سەری هەڵدا و هاوكاتیش لەگەڵیدا هەڵمەتێكی پڕوپاگەندە دەستی پێكرد كە لە لایەن سوخۆرە جیهانیەكانەوە ئەو ئەركە سپێردرا بە شانەكانیان لە لایەك و لە لایەكی دیكەوەشە سپێردرا بە ڕۆژنامە بە كرێ گیرەكان بە شێوەیەك كە توانیان گەلی ئەمەریكا بكەیەننە ئەو باوەڕەی كە ئەو لایەنەی كە بەر پرسیارە لە قەیرانە ئابوریەكە حكومەتە لە كاتێكدا كە سوخۆرە پیلان گێڕەكان لە پشت پەردەوە بە نادیاری مابونەوە.

ڕەوشی هاتنە ناوەوە:

لێرە بە دواوە سوخۆرەكان ئیدی شێوازێكی دیكەیان بەكار هێنا بۆ هاتنە ناوەوە بۆ ناو كەرتی ئابوری دوای ئەوەی كە ئیدی بەربەستێكی سەرەكی نەمابو لەبەردەمیاندا. لە ساڵی ١٨٩٩ خاوەن بانكە جیهانیەكان كۆنگرەیەكیان بەست لە لەندەن بە ئامادە بونی (ج. ب مۆرگان) و (ئەنتۆنی دریكسیل) وەك نوێنەری بانكە ئەمەریكیەكان، كاتێكیش كە گەڕانەوە بۆ ئەمەریكا، دامەزراوەی ڕۆتشیڵد مۆرگانی كردە نوێنەرو بەڕێوە بردنی بەرژەوەندییەكانی (نهێنی و ئاشكرا) لە وڵاتە یەككگرتوەكانی ئەمەریكا، ئەویش توانای خۆی بۆ ئەو پۆستە كاتێك سەلماند كە توانی بڕێكی زۆر چەكی كۆن بفرۆشێت بە حكومەتی ئەمەریكا.. ئەڵبەتە ئەم كۆنگرەیە ئامانجێكی دیكەی سەرەكی هەبو كە بریتی بو لە قۆرخكردنێكی جیهانی لە لایەن ئەم دامەزراوە داراییانەی لای خوارەوە:

١. كۆمپانیای ب . مۆرگان و هاوبەشەكانی لە نیویۆرك.

٢. كۆمپانیای دریكسیل و هاوبەشەكانی لە فیلادلفیا لە وڵاتە یككگرتوەكانی ئەمەریكا.

٣. كۆمپانیای مۆرگان – هاجیس و هاوبەشەكانیان لە پاریس.

٤. دامەزراوەی م.م. واربۆرگ لە ئەڵمانیا وهۆڵندا.

ئەم قۆرخ کارییەش خرایە ژێر چاودێری دامەزراوەی ڕۆتشیڵد.

دواتر چەند هەنگاوێکی دیکە نرا بۆ لەبەر یەك هەڵوەشاندنی ئابوری ئەمەریکا، لە ساڵی ١٩٠١ چالاکییە گەرەکەیان ئەنجامدا: یەکێتی دارایی مۆرگان- دریکسیل توانی بواری پیشەسازی قۆرخ بکات و توانیان کۆمپانیای (هاینز - مورز) ناچار بکەن کە تەواوی پشکەکانیان بفرۆشن، ئەڵبەتە ئەم کۆمپانیایە ژمارەیەك بانك و کەشتی و کارخانەی ئاسن و پۆڵای هەبو کە تێکڕایان کەوتە ژێر دەستی مۆرگان- دریکسیل. بەم شێوەیەو لە دەرەنجامی زاڵ بونیان بەسەر کەرتە گرنگەکاندا توانیان دەست بخەنە هەڵبژاردنەکانی ئەمەریکای ئیتحادی و توانیان پشتیوانی تیۆدۆر ڕۆزفێلت بکەن تا بو بە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

ئامانجی قۆرخکارەکان لە گەیاندنی (تیۆدۆر ڕۆزفێلت) بە پۆستی سەرۆك کۆماری تەنها دەسەڵات نەبو، بەڵکو ئامانجێکی دیکەشیان هەبو کە ئەویش بریتی بو لە پاراستنی سەرانی قۆرخکاری لە دەستی دادپەروەری ئەمەریکی لەبەر ئەوەی لێکۆڵینەوەی ئەکرد لەو فراکسیۆنە نایاساییەو لەو ڕەوشانەی کە بە شێوەیەکی ڕێکخراو نەیارەکانی پێ لەناو ئەبرد لە بازاڕدا، کاتێك کە ڕۆزفێلت گەیشتە پۆستی سەرۆکایەتی، هەستا بە دامەزراندنی (سیناتۆر ئەلدریك) وەك سەرۆکی لیجنەی لێکۆڵینەوە، ئەو کەسەی کە دواتر دەرکەوت هاوبەشێکی شاراوەی قۆرخکردنی توتن و پلاستیك بو، ئەو دوبوارەش کە لە لایەن مۆرگان-دریکسیل ەوە قۆرخ کرابو...

بەم شێوەیە ئەو لێکۆڵینەوەیە هیچ دەرەنجامێکی نەبو، لە ساڵی ١٩٠٧ نوێنەری کۆمپانیای (واربۆرگ) گەیشتە وڵاتە یەکگتروەکانی ئەمەریکا، ئەو نوێنەرە ناوی پۆل واربۆرگ بو و لەگەڵ خۆیدا لێکۆڵینەوەیەکی وردی هێنابو لەسەر دۆخی دارایی یەك بە یەکی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمەریکا، ئەوەندەی نەبرد ئەم کەسە بوە هاوبەش لە کۆمەڵەی دارایی مەزنی (کوهین - لوب) لە نیۆیۆرك، دوای ماوەیەکی کەم کەسێکی دیکە پەیوەندی پێوە کردن بەناوی (یەعقوب شیف)، ئەو کەسەی کە نێوەندە هەواڵگرییەکان باش دەیاننناسی بەو

پێیەی کە ئەوە ئەو بو کە پارەی دابین ئەکرد بۆ جوڵانەوە تیرۆریستی و ئانارشیستەکانی ئەوروپا و ڕوسیا لە ساڵی ١٨٨٣ەوە تا دەرکەوتنی شۆڕشی ڕوسیا لە ساڵی ١٩١٧، ئەم کەسە وەك نوێنەری ڕۆتشیڵد پەیوەست بو بەو کۆمپانیایەوە...

قۆرخکاری گەورە باڵ ئەگرێت بەسەر ژیانی ئابوریدا

دامەزراندنی قۆرخکاری گەورە – کۆبونەوەی ساڵی ١٩١٠

شەوی ٢٢ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٠ شەمەندەفەرێکی تایبەت لە وێستگەی هوبکن لە ویلایەتی (نیوجرزی)وەستا، یەکەم کەس کە سەرکەوت سیناتۆر ئەلدریك بو و یەکێك لە گەورە بەرپرسانی وەزارەتی دارایی هاوڕێیەتی دەرکرد ئەویش (ئا . بیات) بو، ئەوەندەی ئەبرد کە ژمارەیەك پیاوی دیکەش گەیشتن کە تا ئەو کاتە کەسیان ئەبرینرا بون، ئەوانە لە ڕاستیدا سەرانی ئابوری ئەمەریکا بون... ئەو پیاوانە ئەم ناوانەی لای خوارەوە بون:

فرانك فاندربیلیت: سەرۆکی بانکی جیهانی لە نیویۆرك، ئەو بانکەی کە نوێنەری بەرژەوەندییە پیشەسازییەکانی کۆمپانیاکانی ڕۆکفلەر بەو، هەروەها نوێنەری بەرژەوەندی کۆمەڵەی (کوهین – لوب) بی سەر بە کۆمپانیاکانی شەمەندەفەر و بانکی کە خاوەن شەکر بو.

– هـ.ب داڤیدسۆن: هاوبەش و نوێنەری کۆمەڵەی مۆرگان.

– پۆل واربۆرگ.. ئەو کەسەی کە وەك دەوڵەمەند ترین پیاوی جیهان ناوبانگی دەرکردبو.

– بنیامین سترۆنگ: یەکێك لە چەمسەرەکانی وۆڵ ستریت، گەورەترین شەقامی پارە لە جیهاندا، قۆرخکارییەکانی مۆرگان کرێکی کرد کە قەیرانێکی دارایی گەورە دروست ببێت لە ساڵی ١٩٠٧ و لە ڕێگەیەوە قۆرخکارەکان توانیان قازانجێکی خەیاڵی بکەن.

ئەم کۆبونەوەیە شاراوە نەبو لە چاوی ڕۆژنامە نوس و ئەو هەواڵدەرانەی کە گشت شوێنێکیان تەنی بو و هەواڵی کۆبونەوەکەیان لە تەواوی بەریتانیا بڵاو کردبۆوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیان توانی مۆڵەت لە هیچ کام لە جەمسەرەکانی پارە بەدەست بهێنن، دواتر زانرا کە ئەو شەمەندەفەرەی کە کەسە کۆبوەکانی لەخۆ گرتبو بەرەو دورگەی منگۆلا لە ویلایەتی جۆرجیای ئەمەریکا ڕۆیشت، ئەو شوێنەی کە مۆرگان تیایدا کۆشکێکی شاراوەی هەیە.

ئەم کۆبونەوەیە هەروەك ئەبینین سەرانی ئابوری، سەرمایە، گەیاندن و، پیشەسازی قورسی لە خۆ گرتبو و لەگەڵ ئەوەشدا هەستابون بە کێشانی پەرژینێکی ئاسنین بە دەوری ئەوەی کە لە کۆبونەوەکاندا ڕوی دابو. درەنجامەکان دەریان خست کە قۆرخکارانی گەورە و شاراوە لەو کۆبونەوەیەدا لە دایك بون، ئەوانەی کە باڵیان کێشاوە بەسەر کەرتەکانی ئابوری ئەمەریکا و شەرێکی قورسیان لەدژی کۆمپانیا و دامەزراوە نیشتیمانیەکان ڕا گەیاندوە، دواتر یانەیەك دامەزرا کە ناسرابو بە یانەی (ناوی یەکەم) کە تەنها ئەو کەسانە بونە ئەندام تیایدا تا بە شێوەیەکی بەردەوام کۆببنەوە و ڕێگری بکەن لە هاتنە ناوەوەی هەر بێگانەیەك بۆ ناویان. لە دەرەنجامی کۆبونەوەکە ئەلدریك پرۆژە یاسایەکی پێشکەش بە کۆنگرێس کرد – هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا ناوبراو ئەندام و سەرۆکی لیژنەی دارایی بوە – کە دواتر ناسرا بەناوی (یاسای یەدەگی دارایی ئەمەریکا ساڵی ١٩١٣). گەلی ئەمەریکا ئەو کاتە و ئێستاشی لەگەڵ بێت پێی وایە کە ئەو یاسایە تەنها بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دانراوە لەبەر ئەوەی ڕێگە بە حکومەتی ئیتحادی ئەدات تا سەپەرشتی تێکڕای پارەی یەدەگی ئەمەریکی بکات بەڵام لە ڕاستیدا کاریگەرییەکی شاراوەی دیکەی هەبو، لەبەر ئەوەی کە سەرانی پارەی ئەمەریکا و ئەوروپای خستبوە نێوەندێکەوە تا بتوانن پاڵپشتی دارایی و ئاڕاستەی جەنگی جیهانی یەکەم

بەرهەمی جەنگی کیمیایی جارێکی دیکە پەکی کەوت و دوبارە قەیرانەکە گەڕایەوە و هەڕەشەی لەسەر وەزارەتەکەی ئاسکویت دەرکرد و. پاڵەوانە ساختەکان بەدور بون لە گلەیی لێکردن و بە شان وباڵیاندا هەڵ دەدرا...

لە کۆتاییدا دەبێت بڵێین کە سێر فریدریك ناتانی ناوبراو کە سەرپەرشتی بەرهەمی کیمیایی ئینگلیزی ئەکرد و نوێنەری شا بو بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو کارە لە ئینگلتەرا، دواتر هەر خۆی کرایە سەرۆکی ئاژانسی جولەکە لە فەلەستین..؟

لە دوای کەوتنی ئاسکویت و دەست بەکار بونی هەر سێ زایۆنیست (جۆرج-بلفۆر-تشێرل) دواتر هەڵوێستی جەنگ هەڵ گەڕایەوە دوای چونی بلفۆر بۆ نیۆیۆرك بۆ پەیوەندی کردن بە سوخۆرە جیهانیەکان، ڕەنگە پرسیار بکەین کە هۆکار چی بوە کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بۆخۆی چوە بۆ نیۆیۆرك بۆ پەیوەندی کردن بەو کەسانە لە کاتێك دا کە کۆمەڵەی ڕۆتشێلد نێوەندە سەرەکییەکەی لەناو لەندەن بو هەروەك چۆن پێشتر ئامارژەمان پێدان. وەڵامی ئەم پرسیارەمان لەم برگەیەی خوارەوە دەدۆزینەوە، لە ئینسکلۆپیدیای زانیاری جولەکە بەم شێوەیە باس لەو زانیارییە ئەکات: جەنگی جیهانی بە ناچاری هۆکار بو بۆ گواستنەوەی نێوەندی ڕێکخراوی جولەکە لە بەرلینەوە بۆ نیۆیۆرك و دەسەڵات بە تەواوەتی گوازرایەوە بۆ لیجنەیەکی یەدەگی زایۆنیزم بە سەرۆکایەتی دادوەری جولەکەی ئەمەریکی ل.ب. براندندیس.

ئەم برگەیە پێویستی بە ڕون کردنەوەی زیادتر نیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی پێ زیاد ئەکەین کە نوسەری ئینگلیزی لەوبارەیەوە بۆ ل. فرای ئەڵێت لە کتێبەکەی بەناونیشانی ئەوانەی کە بە ئاراستەی ڕۆژهەڵات هەڵدەقولێن[٧٠]، لەم کتێبەدا هاتوە کە: "لەو کاتەوە واتە لەکاتی گواستنەوەی نێوندی ڕێکخراوی زایۆنیزم بۆ ئەمەریکا، هەژمونیان ڕوی لە زیاد بون ئەکرد لە نێوەندە سیاسیەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا و ئاژانسی کۆچی جولەکە بە شێوەیەکی

---

([٧٠]) ئەم کتێبە بە تەواوەتی لە کتێبخانە و بازاڕ کۆ کرایەوە.

تایبەت بو بە هێزێك کە ئەتوانێت پارە و زانیاری بنێرێت بۆ سەرچاوە تێك دەرەکانیان لە سەرتاسەری جیهاندا".

هەروەها لێرەدا نوسینێکی نوسەری جەنگی ئەمەریکی بە ناوی (م. ئەرز بێرگەر) ئەهێنینەوە لە کتێبێکی بە ناو نیشانی "ئەزمونەکانم لە جەنگی جیهانی یەکەمد" لە پەرەکانی ١٤٥- ١٤٦: " دامەزراوەی ئەلیناسی ئیسرائیلی لە ١٦ ئازاری ١٩١٦ بری ٧٠٠,٧٠٠ فرانکی فەرەنسی رەوان کرد بۆ کۆری رۆژهەلاتی گەورە لە پاریس هەروەها لە ١٨ ئازاری ١٩١٦ بری یەك ملیۆن لیرەی ئیتالی رەوانەی کۆری رۆژهەلاتی گەورە کرد لە رۆما هەروەك لە دۆسیێ کانی کۆردا هەلگیراوە، ئەوەندەش سادە نیم کە پێم وابێت ئەو پارانە دراوە تا دابەش بکرێت بەسەر جولەکە هەژارەکاندا بەلکو بە دلنیاییەوە ئامانجی دیکە لەپشت ئەو کارەوەیە.

لێرەدا پێویستە جیاکاری بکەین لە نێوان ماسۆنیەتی سەر بەکۆرەکانی رۆژهەلاتی گەورە کەلە ژێر دەسەلاتی خاوەن سەرمایە جیهانیەکانە لەگەل ماسۆنیەتی ئازاد کە باوەری بە (ئەندازیاری مەزنی گەردون) هەیە کە هێشا ئەوانە نەیان توانیوە دەست بگرن بەسەری دا.

لێرەدا دێینەوە سەر ئاشکرا کردنی ئەو وردەکارییەی کە رۆشنایی ئەخاتە سەر ئەو رووداوانەی کە دوای زال بونی زایۆنیەکانە بەسەر دەسەلات لە ئینگلتەرا رویاندا. ئەو ماوەیەی کە مێژونوسی ئینگلیزی ا. ن . فیلدخیر لە کتێبەکەی "هەمو شتەکان" دا باسی لێوە ئەکات و لە پەرەی ١٠٤ دا دەلێت:"بەم شێوەیە دەسەلاتی جولەکە دەرکەوت بە شێوەیەکی ئاشکرا دوای ئەوەی کە لوید جۆرج دەسەلاتی گرتە دەست".

## کۆبونەوەی لیژنەی سیاسی رێکخراوی زایۆنیزم

گومانی تێدانیە کە لۆژیکی ئەو رووداوانەی لەسەر گۆرەپانی سیاسی ئەوروپا دەرکەت لەو ماوەیەدا دژی هەر جۆرە لۆژیك و کارێکی مرۆڤانەیە بە

تایبەت پرسی دابەش کردنی داگیر کارییانەی جیهانی عەرەبی و وڵاتە نوێکان و پرسی فەڵەستین بە شێوەیەکی تایبەتی.

گومانی تێدا نیە کە کۆبونەوەی یەکەمی لیژنەی سیاسی ڕێکخراوی زایۆنیزم ئەو کاتە ئەنجامدرا کە لوید جۆرج دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەو کۆبونەوەی لە ٧ شوباتی ١٩١٧ لە لەندەن ئەنجامدرا و لێرەدا باسی وردی دانەنێین بۆ نوسەر ل. فرای و لێرەدا چەند بڕگەیەکی دیکە لە کتێبەکەی "ئاوگەلێك هەڵ دەقولێت بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات" لە لاپەڕە ٥٥ دا:

کۆبونەوەی فەرمی یەکەمی لیجنەی سیاسی ڕێکخراوی زایۆنیزم لە ٧ شوباتی ١٩١٧ دا ئەنجامدرا لە ماڵ موسا گاسنەر و ئەم کەسایەتیانەش لە کۆبونەوەکەدا ئامادە بون:

- لۆرد ڕۆتشیڵد سەرۆکی لقی ئینگلیزی کۆمەڵەی ڕۆتشیڵد.
- جیمس دی ڕۆتشیڵد کوڕی (ئەدمۆند دی ڕۆتشیڵد) سەرۆکی بەشی فەڕەنسی کۆمەڵەی ڕۆتشیڵد و دامەزرێنەری داگیر گەکانی ڕۆتشیڵد لە فەڵەستین کە گرنگترینیان بریتیە لە (ریشون لویزون)[٧١].
- سێر مارك سایکس[٧٢] ئەوەی کەلە خانوەکەی خۆی بو لە لەندەن لە گەڕەکی (باکینگهان گیس) لەناو کۆشکی شاهانە. هەروەها نێوەندی سەرکردایەتی جوڵانەوەی زایۆنیزم لە ئینگلتەرا ئامادە کرابو بۆ ئامێری بێتەل و تایبەت...
- سێر هێربرت بنویتس، ئەمینداری گشتی دواتری لە فەڵەستین.. واتە سەرۆکی دەزگای دادوەری و ئەو کەسەی کە یاساکان لە فەڵەستین دادەنێت و سەرپەرشتی جێبەجێ کردنی ئەکات.

---

(٧١) پێویستە لێرەدا ئەوە باس بکەین کە ئەدمۆند دی ڕۆتشیلد دامەزرێنەری شاری تەل ئەبیب و ژمارەیەکی دیکەی زۆر داگیرگەکانی جولەکە بوە لە فەڵەستین.

(٧٢) سێر مارك سایکس یاخود (سایکس)ی بەناوبانگ نوێنەری ئینگلتەرا بو لە ڕێك کەوتنی (سایکس بیکۆ)ی بەناو بانگ کە بە پێی ئەو ڕێك کون نامەیە سوریا و لوبنان و فەڵەستین و ئەردەن و عێراق دابەش کرا لە نێوان داگیرکەری فەڕەنسی و ئینگلیزی و لەو پاڵنەرانەمان بۆ ڕون ئەکاتەوە کەلەو ڕێك کەوتن نامەیەدا هەبوە و بۆتە هۆی گۆڕینی چارەنوسی نەتەوەی عەرەب.

- هاری ساشر.
- جۆزێف کادۆن.
- حایم وایزمان.. سەری سیاسی گەورەی زایۆنیزم.
- ناحوم سوکولون، سەرپەرشتیاری دەزگاکانی ڕاگەیاندن، هەر ئەو کەسەی کە دواتر کتێبی (مێژوی زایۆنیزم) ئەنوسێت.

بابەتی سەرەکی ئەو کۆبونەوەیش هشت و مڕ کردن بو لەسەر ئەو پەیڕەوەی کەوەک بنەمایەك بۆ دانوستانە فەرمیەکان دادەنرێت: ئەو بڕیارەی کە چارەنوسی فەلەستین، ئەرمینیا، عێراق و سعودیە و تەواوی خۆرهەلاتی ناوەڕاست بە شێوەیەکی گشتی دیاری ئەکات.

سیاسەت مەداری ئەمەرکی (م جیگرین) ئەم زانیاریانە زیاد ئەکات لەسەر ئەو کۆبونەوەیە لە پەڕەی ١٣٩ لە کۆمەلەی ئەو ڕاپۆرتانەی کەبەرزی کردبۆوە بۆ لایەنە بەرپرسەکان لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

وردەکاری ئەم کۆبونەوەیە بە کۆد بەرز کرایەوە بۆ بەشی ڕێکخراوی زایۆنیزم لە ئەمەریکا... دواتر ئەم لقە ئەمەریکیە لەو کاتەوە دەستی کرد بە دەست وەردان لە کاروباری ناوخۆی بەریتانیا و سیاسەتی حکومەتی بەریتانی ئاراستە ئەکرد لەبەر ئەوەی کە پەیوەندی هەبو بە بواری تایبەتمەند بە خۆیەوە.

بۆ ئەوەی کە زیادتر باس لە هاتنە ناوەوەی زایۆنیزم بکەین بۆ ناو دەزگاکانی دەسەلات لە ئینگلتەرا لەو کاتەدا، لێرەدا بەشێك لە دانپیادانانەکانی سامۆییل لاندمان ئەخەینە ڕو کە لە کتێبەکەی بە ناونیشانی (جولەکەی جیهانی) هاتوە و لە سالی ١٩٣٦ لە لەندەن چاپ کرا.

"دوای ئەوەی کە ڕێك کەوتنەکە ئەنجامدرا لە نێوان سێر مارك سایکس و حاییم وایزمان و سوکولوف، بڕیار درا کە نامەیەك بە کۆد بنێردرێت بۆ دادوەری ئەمەریکی (ل.هبراندین) کە سەرۆکی لیجنەی فریاکەوتنی زایۆنیزم بو لە نیویۆرك – تا پێی بلێم کە حکومەتی بەریتانیا ڕەزامەندە بە هاوکاری کردنی جولەکە تا فەلەستین بەدەست بهێنێتەوە لە بەرامبەر هاوپەیمانی جولەکەی

جیهانی لەگەڵ بەریتانیا و پەیوەست بونی زایۆنیزم لە ئەمەریکا شان بەشانی هاوپەیمانەکان - تا ئەو کاتە ئەمەریکا نەچوبووە شەڕەوە - و بەڵێن بدات کە تەوژمێکی توند دروست بکات تا پشتیوانی بیرۆکەی پەیوەست بونی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بکات تا لەگەڵ بەریتانیا بچێتە شەڕەوە و هەڵوێستی بێ لایەنانەی ئەمەریکا هەڵبوەشێنێتەوە.. هەروەها نامەیەکی هاوشێوە نێردرا بۆ جەنەراڵ (ماك دوناف) فەرماندەی پرۆسەکانی سوپای ئینگلیز.. و دکتۆر وایزمان لەو کاتەوە بە ئەندازەیەك بوە خاوەن هەژمون کە توانی بە نامەیەکی سادە کە بۆ جەنەراڵ (ماك دۆناف)ی ناردبو ناچاری بکات تا لە لای فەرماندەیی سوپای بەریتانیا دەست وەردان بکات تا شەش گەنج ببەخشێت لە خزمەت کردن لە بەرەی جەنگ، سەرباری ئەوەی کە حاڵەتی جەنگ بە هیچ شێوەیەك ڕێگە بەوە نادات کە هیچ کەسێك ببەخشرێت لە خزمەتی سەربازی.. بەڵام ئەمە ڕێگری نەکرد لە دکتۆر وایزمان کە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە کارەکەیدا کە بریتی بو لە بەخشینی ئەو شەش گەنجە لە خزمەتی سەربازی لە بەر هۆکار گەلێك کە پەیوەندی هەبوە بە بەرژەوەندی باڵای نیشتمانەوە.. بەڵام ئەم بەرژەوەندییە باڵایە هیچ نەبو جگە لە دامەزراندنی نوسینگەی تایبەتی زایۆنیزم کە سەر بە دکتۆر وایزمان بو. ئەو شەش کەسەش بریتی بون: من خۆم و پێنج کەسی دیکە کە لە ناویاندا کەسێك هەبو بەناوی هاری ساشەر کە ئەندامی لیجنەی سیاسی ڕێکخراوێکی زایۆنیزم بو. حکومەتی ئینگلیزی نوێش - حکومەتی لوید جۆرج و تشێرشل و بلفۆر - ئەو ڕێکخراوە زایۆنیەیان بە دۆست و هاوپەیمان دادەنا ئەمەش دەسەڵاتێکی زۆری بەخشیبو بە نوسینگەکەمان وەك دەسەڵاتی بەخشینی گوزەر نامە بۆ هەندێك کەس و دابین کردنی گواستنەوە و پشتیوانی کردنی داراییان..

بۆنمونە من جارێك بەڵگەنامەیەکم لەسەر کەسێکی جولەکەی عوسمانی خستە ڕو بەو پێیەی کە دۆستی خۆمانە، ئەمەش بەس تا وەزارەتی ناوخۆی بەریتانیا ڕازی بن بەوەی کە تەواوی ئاسانکاری بکەن سەرباری ئەوەی کە

دەوڵەتی عوسمانی ئەو کاتە لە شەڕ دابون لەگەڵ ئێمە واتە ئەبوایە ئەو عوسمانییەی وەك دوژمن سەیر بکردایە..

بۆ ئەم بەشە ئەوەندە زانیاری ئەخەینە ڕو و بەوەش کۆتایی پێ ئەهێنین کە هەنگاوی یەکەمی سەرەکی کە حکومەتەکەی لوید جۆرج - بلفۆر - تشێرشل دوای دەسەڵات گرتنە دەستی ئەنجامی دا بریتی بو لەوەی کە لوید جۆرجی سەرۆك وەزیر بە ڕەسمی ڕایگەیاند کە سیاسەتی بەریتانیا پشتیوانی پلانەکەی ڕۆتشیڵد دەکات بۆ دامەزراندنی "نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ گەلی جولەکە لە فەڵەستین".

# بەشی هەشتەم

## پەیماننامەی ڤێرسای

لە مێژودا هەڵەی زۆر كراوە و پەیماننامە و كۆنگرەی زۆر بەستراوە كە دەرەنجامێكی خراپ و چاوەڕوان نەكراوی هەبوە لە زۆرێك لە وڵاتەكاندا، بەلام مێژوی مرۆڤایەتی هاوشێوەی ئەو پەیمان نامەیەی نەبینیوە كە كۆتایی پێهانرا بە جەنگی جیهانی یەكەم:

پەیماننامەی ڤێرسای كە بە هۆیەوە تەواوی جیهان ناڵاندی بەهۆی دەرەنجامە خراپەكانیەوە و تا ئێستاش ئەناڵێنێت بەدەست ئەو كێشانەی كە دروستی كردوە.. بەڵكو ئەوەی كە ئێستا لە ڕوی زانستیەوە هەموان لەسەری كۆكن ئەوەیە كە ئەوە هەر ئەو پەیماننامەیە بو كە بوە هۆی چاندنی تۆوی جەنگی جیهانی دووەم. ئەم پەیماننامەیە سیمای تەواوی جیهانی تێكدا و داگیرگەكانی وەك شوێنی هەژمون و دەسەڵاتی كردە جۆرێكی دیكەی لە داگیر كردن... هەروەها ژمارەیەك گرێی چارەسەر نەكراوی هێنایە ئاراوە بە هۆی دابەشكردنی گەلان و دەوڵەتەكان بە شێوەیەكی ملهوڕانە و دیاری كردنی چارەنوسی گەلان بەو شێوەیەی كە خۆیان ئەیانویست ئەمەش جۆرێك كینە و بێ سەرەوبەرەیی لە گشت شوێنێك دا دروست كرد.

سروشتی بو كە جۆرێك لە سەرسوڕمان و توڕەیی گشت شوێنێك بگرێتەوە دوای ئەم پەیماننامەیە دوای ئەوەی كە ئیدی هێدی هێدی دەرەنجامە خراپەكانی دەردەكەوت. ڕای گشتی جیهانیش نەیزانی كەچۆن ئەوە ڕوی دا،

ئەو کەسانەش کە سەرپەرشتی دانوستانەکانیان ئەکرد لە سیاسیە شارەزاکانی جیهان بون کەلە لایەن دەستەبژێرێك لە شارەزا نێودەوڵەتیەکان هاوکاری ئەکران.. کەواتە دەرەنجام ئەوە بو کە ژمارەیەك لە نیشانەکانی سەرسوڕمان لە دەوری ئەم پەیماننامەیە هەیە و ئێمەش لێرەدا -هەروەك بەشەکانی پێشو- کار ئەکەین لەسەر لابردنی پەردە لەسەر وردەکارییە شاراوەکانی تا ڕاستی و دروستیمان بۆ دەر بکەوێت.

دەرەنجامی یەکەمی پەیماننامەکە: دۆخ لە ئەڵمانیا:

چاودێرە بێلایەنەکان پێیان وایە کە نوێنەرەکانی جیهان ئەوەی کە پێی دەوترێت شارستانی بە ڕێژەیەکی زۆر کەم زانستیان بەکار هێناوە لە نوسینەوەی ئەو پەیمان نامەیەدا.. ڕاستی ئەم بڕیارەمان لە لە حاڵەتی ئەڵمانیادا بۆ دەر ئەکەوێت، گەلی ئەڵمانیا زۆر بە ڕەقی مامەڵەی لەگەڵ کرا و دوای ئەوەش کە کار لەکار ترازا بەوە زانرا کە بە هۆی ئەو پەیماننامەیەوە ستەمی لێکراوە و درەەرنجامی ڕاستەوخۆی ئەو کارەش دروست بونی کینەو ڕقێکی زۆر بو لە لای گەلی ئەڵمانیا. بۆ ئەوەش کە درك بە مانای ڕاستەقینەی مافی ئەڵمانی بکەین ئەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئەو دۆخەی کە تیایدا واژۆ کرا لەسەر ڕێککەوتننامەی ئاگربەست لە ١١ تشرینی دووەمی ١٩١٨، ئەو کاتە سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا داوای ئاگربەستی کرد نەوەك خۆ بەدەستەوە دان.. جیاوازیش لە نێوان ئەم دو حاڵەتەدا زۆرە.. دواتر سەرکردایەتی ئەڵمانیا داوای ئاگر بەستی ئەکرد لەبەر ئەوەی کە هێزەکانی ئەڵمانیا شکستی خواردبو یاخود لەوەدا بو کە شکست بخوات، بەڵکو داوای کرد تا دەستی کراوە بێت بۆ ڕو بە ڕوبونەوەی مەترسی ناوخۆ، ئەو مەترسیەی کە هەڕەشە بو لەسەر ئەڵمانیا، مەترسی شۆڕشی کۆمۆنیستی بە سەرۆکایەتی ڕۆزا لۆکسمبۆرگی جولەکە.

ئاگربەست پێشەکییەکی دروست کرد بۆ دانوستانەکانی ئاشتی لەنێوان هەردولادا، ئەو ڕاستیەی کە نابێت لەپێش چاومان ون بێت کاتێك کە لێکۆڵنەوە ئەکەین لە دەرەنجامەکانی پەیماننامەی ڤێرسای..

ئەو ڕوداوانەی کە سوپای ئەڵمانیای هێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە پێویستە داوای ئاگر بەست بکات لەو کاتەوە دەستی پێ کرد کە شانە نهێنیەکانی ڕۆزا لۆکسمبورگ توانیان بخزێنە ناو نێوەندی سوپای شەڕکەرەوە بەتایبەت بۆ ناو هێزی دەریایی، ئەو هێزەی کە پلانە شۆڕشگێڕیەکە تەواوی توانای تیادا کۆکردبۆوە، بەم شێوەیە لە ناکاو پڕوپاگەندەیەك بڵاو بۆوە لە ساڵی ١٩١٨ لەناو هێزە دەریاییەکاندا بەو ناوەڕۆکەی کە گوایە سەرۆکایەتی ئەڵمانیا بڕیاری داوە زۆرینەی کەشتیە ئەڵمانیەکان لە هێرشێکی خۆکوژی دا بکاتە قوربانی و لە دژی کەشتیگەلەکانی ئەمەرکیا و بەرتانیا و فەرەنسا تا زیانی زۆری پێ بگەیەنێت تەنانەت گەر خۆشی لەناو بچێت وەك سەرەتایەك بۆ داگیر کردنی بەریتانیا دوای ئەوەی کە ئیدی کەنارەکانی بەبێ هێزی پاسەوانی ئەبێت، شانە نهێنیەکان ئەو پڕوپاگەندەیەیان بەهێز کرد و هانی خۆپیشاندانیان کرد و دەیان وت کە ئەو هێرشە شکست ئەهێنێت بەو پاساوی ئەهێنایەوە کە فڕۆکەکانی هاوپەیمانان هێرش بە چەکی کیمیایی ئەکاتە سەر کەشتیەکانیان و ئەو هێرشە کەشتیەکان ئەکاتە یەکپارچە ئاگر و تەواوی سەر نشینەکانی ئەسوتێن ئەوانەی کە ئەخنکاون و ماون.. کاتێکیش کە هەڵمەتی هێرشەکان گەیشتە ئەو پەڕی، بانگەشە کەرانی یاخی بون ئیدی بە ئاشکرا و لەسەر کەشتیەکان قسەی خۆیان ئەکرد لەسەر ئەو چارەنوس و هێرشە شکست خواردوە.. لە ٣ تشرینی دووەم دەریاوانەکانی کەشتی گەلی ئەڵمانیا یاخی بونی خۆیان ڕاگەیاند.. لە ٧ تشرینی دووەم ئەندامانی یەکەیەکی دەریایی هەڵهاتن لە کاتی چونیان بۆ بەرەیەکی شەڕ لەگەڵ فەرەنسا و لەناکاو پڕپاگەندەیەك بڵاو بۆوە کە دەیوت ئەوان ئەڕۆیشتن تا ببنە قوربانی هێرشێکی خۆکوژیانە.. لە هەمان کاتدا لە زۆر کەرتی پیشەسازی دا ئاناڕامی زۆر دەستی پێکرد کە بوە هۆی پەك خستنی بەرهەمهێنان و کەسانێك دەرکەوتن کە لە زۆر

شوێندا گیانی خۆبەدەستەوەدانیان بڵاو کردەوە. بەم شێوەیە دۆخەکە لە ئەڵمانیا قەیراناوی بو تا گەیشتە ئەو ئاستەی کە ئیدی قەیسەر هیچی بەدەستەوە نەما جگە لەوەی کە دەست بەرداری دەسەڵات ببێت لە ٩ تشرینی دووەمی ١٩١٨.

دەست بەجێ دوای دەست لەکار کێشانەوەی قەیسەر حکومەتێکی سۆشیالستی دەست بەکار بو کە یەکەمین کاری ئەوەبو لە دوای تێپەڕینی دو ڕۆژ ئاگر بەست واژۆ بکات. بەڵام خۆپیشاندانەکان کۆتاییان پێ نەهات، بەڵکو توندوتیژی زیادتر بەخۆوە بینی ئەم جارەیان لەدژی کۆمارییە سۆشیالستەکان، ڕۆزا لۆکسمبۆرگ لە پێناو کۆتایی هێنان بە خۆپیشان دانەکان ئەو مەرجەی دانا کە ئەبێت سوپای ئەڵمانیا ببەخشرێت لە خزمەتی سەربازی. کاتێکیش کە ئەڵمانیا بە بێ سوپای مەشق پێکراو مایەوە کە بتوانێت کۆتایی بە خۆپیشان دانەکان بهێنێت، سەرکردەی جولەکەی کۆمۆنیست لە سۆشیالستەکان هەڵ گەڕایەوە و لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩١٩ شۆڕی لە بەرلین ڕا گەیاند و توانی لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە دەسەڵات بەدەست بهێنێت کە زۆرینەیان جولەکە بون..

ئەم شۆڕشە کاریگەرییەکەی دەرەکی چاوەڕوان نەکراوی هەبو بەو پێیەی کە لە بارەیەوە ناکۆکی کەوتەوە لە مۆسکۆ لەنێوان دو سەرکردەی شۆڕی کۆمۆنیستی کە ئەوانیش لینین و ترۆتسکی بون... لینین بە هیچ شێوەیەک ئامادە نەبو کە هاوکاری ڕۆزا لۆکسمبۆرگ بکات..

بەڵام ترۆتسکی جولەکە هەڵوێستێکی پێچەوانەی گرتە بەر دوای پشتیوانی تەواوەتی ئەو شۆڕشەی کرد لە یەکێتی سۆڤێت. هاوکاری نەکردنی ڕۆزا لۆکسمبۆرگ لە لایەن لینینەوە یەکلا کەرەوە بو لەو هەڵوێستەدا لەبەر ئەوەی جولەکەکان هەستیان کرد کە گۆشەگیرن لە کاتێکیدا کە ئەو شۆڕە کاردانەوەیەکی توندی لەلای نەتەوەییەکانی ئەڵمانیا دروست کرد و کەوتنە پەلاماردان و کوشتنی لایەنگرانی ڕۆزا لۆکسمبۆرگ، یەکێک لە ئەفسەرە گەنجەکانی ئەڵمانیا ڕۆزا لۆکسمبۆرگ و کارل لیبکنختیی جێگری یەکەمی

دەست گیر کرد و ئەوەندەی فیشە پێوەنان تا لێی برا دواتر کارەکە بو بە کوشتارگەیەکی گەورە و ڕقێکی گەورە بەرامبەر بە جولەکەکان تەقیەوە لەبەر ئەوەی کە بە بەرپرسیاری یەکەم زانران لە دۆڕاندنی شەڕەکەدا، ماڵەکانیان لە شەودا پەلامار درا و بە هەزارەها پیاو و ژن و منداڵیان و برد و سەرجەمان تیر باران کردن.

بەم شێوەیە دۆخ لە ئەڵمانیا لوا بۆ جولانەوەی ڕەگەز پەرستی ڕەگەزی باڵا، یاخود بە مانایەکی دیکە بۆ دەرکەوتنی هیتلەر و نازیزم... ئەمەش دەرەنجامی ئەو ڕۆڵە شومە بو کە جولەکە گێڕای لە دژی گەلی ئەڵمانیا لە هێزی دەریای و پیشەسازی ئەڵمانیا و دواتر پەیماننامەی ڤێرساری کە بوە هۆی سەپاندنی مەرجی ناڕەوا و قورس بەسەر ئەڵمانیادا.

لینین لە کۆنگرەی نێونەتەوەیی سێهەمدا ڕایگەیاند کە خودی ڕۆزا لۆکسمبۆرگ بەرپرسیار بو لە شەپۆلی دژایەتی کردنی جولەکە لە ئەڵمانیا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئەوە لە یاد بکەین کە هێزەکانی پیلان گێڕان لەو کاتەوە خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگی جیهانی دووەم، هەر بۆیە ئەم دۆخە بۆ ئەوان گونجاو بو لەبەر ئەوەی مەرجێکی بنەڕەتی لە مەرجەکانی شەڕی داهاتو ئەهێنێتە دی کە ئەویش بریتی یە لە هێنانە ئاراوەی دۆخێك بۆ دروست بونی پێکدادانی چەکدارانە.. بەم شێوەیە ڕون بۆوە کە بەرپرسی دژایەتی کردنی جولەکە و ئەو دۆخەی کەلە ئەڵمانیا هاتە ئاراوە لە دژی جولەکە، هەر خۆیان بون و دواتر هەر خۆیان سودیان لەو دۆخە وەرگرت بۆ پێش بردنی نەخشەکانیان. جولەکە خاوەن سەرمایەکان لەپشت ئەو پیلان گێڕیەوە بون نەوەك دۆخی ئەڵمانیا و دەرەنجام ئەو پلانە بە شێوەیەکی نەخشە بۆ دڕێژراو چوە پێشەوە.

# پرسـی فەڵەستین

دوای ئەوەی کە پیلان گێڕان گەیشتنە ئامانجەکانیان لە ئەڵمانیا، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کەوتنە کارکردن لەسەر ئامانجی دووەم: فەڵەستین، لەبەر ئەوەی بڕیاریان دا – هەر وەك پێشتر ئامارەمان پێدا – کە فەڵەستین بکەنە ڕێڕەو و داهاتو بۆ پلانەکانیان و خاڵی سەرەکی جیهانی لە پیلانگێڕیەکەدا لە بەر ئەوەی فەڵەستین نێوەندی جوگرافی ئەو ناوچەیە کە بە پێی لێکۆڵینەوە جیۆلۆجیەکان دەرکەوتوە کە سامانێکی سروشتی زۆری تێدایە کە بە ملیارەها دۆلار مەزەندە ئەکرێت.. لە بە شێکی پێشوتردا ئامارەمان بەو لێکۆڵینەوانەدا کە بە شێوەیەکی نهێنی لەسەر سامانەکانی ناوچەی دەریای مردو کرا کە بە پارەیەی خەیاڵی مەزەندە دەکرا.. بەم شێوەیە پیلانگێڕان دەست بەکار بون لە ژێر ڕوپۆشێکی نوێدا: زایۆنیزمی سیاسی. زایۆنیزمی سیاسی ئەوەی خستبوە پێش چاوی خۆی کە دەبێت یەکێك لەم دو ئامانجەی خوارەوە و یەك لە دوای یەك بهێنێتە دی:

١. ناچارکردنی وڵاتانی جیهان تا دان بەوڵاتی جولەکەدا بنێن لە فەڵەستین و بەو شێوەیەش دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دێت کە دەبێتە نیشتیمانی پیلانگێڕی و بنکەیەك بۆ داهاتو کە لێوەی کار ئەکرێت بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی سێهەم لە داهاتودا.

٢. ئامانجی دووەم بریتی یە لە دابین کردنی دەسەڵات بەسەر تەواوی سامانەکانی ناوچەکە بە گشتی و سامانەکانی دەریای مردو بە شێوەیەکی تایبەتی لێرەدا ئەو پلانی کارە ئەخەینە ڕو کە بۆ ئەو کارە دانراوە.

هەنگاوی یەکەم بریتی بو لە دەرکردنی بەڵێننامەی بلفۆر لە ساڵی ١٩٦٧ کە بەپێی ئەو بەڵێن نامەیە فەرەنسا و ئینگلتەرا فەرمان بۆ جەنەراڵ ئەلنبی دەر دەکەن تا تورکەکان لە ڕۆژهەلات دەر بکەن و فەلەستین داگیر بکەن، بەریتانیەکان بە کارێکی زۆر نادروستانە هەستان و خۆیان بەدور گرت لە ئاشکرا کردنی پەیمان نامەی بلفۆر تا تەواوی پرۆسە عەرەبیەکانی ئەنجامدا بە هاوکاری عەرەبەکان خۆیان.. بەلاَم سوخۆرە جیهانیەکان هەر کە فەلەستین داگیر کرا داوایان لە حکومەتی بەریتانیا کرد تا لیژنەیەکی زایۆنی لە فەلەستین دابمەزرێنێت و نوێنەرە سیاسیەکانیان وەك ئەندام دابنێت، بەمەرجێك کاری ئەو نوێنەرایەتیە ئەبێت ئەوەبێت کە ئامۆژگاری پێشکەشی جەنەراڵ کلایتۆن بکات کە ئەو کاتە فەرمان ڕەوای سەربازی فەلەستین بو.. ئەم نوێنەرایتیەش لە مانگی ئازاری ساڵی ١٩١٨ دەستی بە کارەکانی کرد و ئەندامەکانیشی بریتی بون لەم ناوانەی لای خوارەوە:

- کۆلۆنێل ئوورمسبی گور کە دواتر کرایە بەڕێوەبەری بانکی ستاندارد[٧٣] لە باشوری ئەفەریقا.. ئەمەش ئەو بانکەیە کە دەستی گرتوە بەسەر کانگاکانی ئاڵتون و ئەلْماس لە باشوری ئەفەریقا و بە هەزارەها کرێکاری ئەفەریقی وەك کۆیلە بەکار ئەهێنێت، هەر ئەویشە کە سیاسەتی ئاپارتاید بەکار ئەهێنێت و ئەو ولاَتەش پەیرەوی لیْ ئەکات.

کۆلۆنێل جیمس دی ڕۆتشیلد.. کوڕی ئەمۆند دی ڕۆتشیلد سەرۆکی لقی فەرەنسای خانەوادەی ڕۆتشیلد و دروست کەری تەل ئەبیب و ژمارەیەکی زۆر لە داگیرگەکانی جولەکە. جیمس دی ڕۆتشیلد دواتر بوە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی بەریتانیا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٩ - ١٩٤٥ دواتر تشێرشل کردیە وەزیر بۆ کاروباری پەرلەمان لە حکومەتەکەی خۆیدا.

- ئەفسەر ئەدوین ساموێلی جولەکە کە بو بە بەڕێوەبەری چاودێری بەریتانی لە حکومەتەکەی تشێرشل لە کاتی جەنگی جیهانی و کاتێکیش کە

---

(٧٣) لەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە کەسێکی سەربازی بکرێتە بەڕێوەبەری بانکێکی بازرگانی گەورە.. ئەمەش بەڵگەی تەواوەتیە لەسەر پەیوەندییە شاراوەکان.

ئیسرائیل دامەزرا لە ساڵی ١٩٤٨ کرا بە بەڕێوەبەری وێستگەی ڕادیۆی ئیسرائیل[٧٤].

– ئیسرائیل سیف، ئەم کەسە ڕۆڵێکی ئادیاری گێڕا لە ترسناك ترین ڕوڵ لە ژیانی سیاسی بەریتانیای هاوچەرخ دا. ئەم کەسە دواتر بو بە سەرۆکی لیجنەی پلاندانای ئابوری و سیاسی. ئەمەش ئەو لیجنەیەیە کە ئاڕاستەی سیاسەتی ئابوری و کاروباری سیاسی وەزارەتە یەك لەدوای یەکەکان ئەکات لە دەسەڵات هەروەك زۆرێك لە چاودێرانی چۆنیەتی کارکردنی دەزگاکانی حکومەت دەزانن لە بەریتانیا، ئەو لیجنەیەی کە سیاسەتی ئابوری و کاروباری سیاسی وەزارەتەکان ئاڕاستە دەکات لە دەسەڵات دا.

– حاییم وایزمان... ئەم کەسە پێویستی بە ناساندن نییە: ئەم لیجنەیە بەر لەوەی کۆنگرەی ئاشتی ببەسترێت و تەنانەت بەر لەوەی کە جەنگیش کۆتایی پێ بهێنرێت نێردرا بۆ فەڵەستین، ئەمەش بۆ ڕەخساندنی کەشێکی گونجاو بەر لەوەی کە وادەی ئەوە بێت کە پرسی فەڵەستین بخرێتە ڕو بۆ مشت و مڕ کردن و بڕیار بدرێت لە پەیماننامەی داهاتودا کە ڤێرسای بو.

دواجار دانوستانەکان دەستی پێ کرد و بریتی بو لە گاڵتە جاڕییەکی ئاشکرا و تیایدا سەرمایە دارە جیهانیەکان پەردەیان لەسەر ڕویان لادا و هەژمونیان بە ئاشکرا دەرکەوت، لێرەدا پێویستمان بە هەوڵێك نیە تا ئەوەمان بۆ ڕون بکاتەوە، تەنها ئەوەندە بەسە کە ئاماژە بەوە بدەین کە سەرۆکی شاندی ئەمەریکی خودی پۆل واربۆرگ بو کە لە بەشی پێشودا بە درێژی باسمان لێوە کرد. ئەم کەسە نوێنەری سەرەکی کۆمەڵەی سوخۆرە جیهانیەکان بو لە ئەمەریکا. سەرۆکی شاندی ئەڵمانیش کەسێك نەبو جگە لە براکەی کە ناوی ماکس واربۆرگ بو. پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە شاندی ئەڵمانی

---

(٧٤) ئەتوانین ئەم کەسە وەك نوێنەری سەرەکی سوخۆرە جیهانیەکان دابنێین بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو پڕوپاگەندانەی کە ئاڕاستەیان ئەکرد.

نوێنەری ئەو دەوڵەتە دوژمنەیە کە جەنگی دۆڕاندن لە کاتێکدا کە شاندی ئەمەریکی نوێنەری یەکێك لە دەوڵەتە سەرەکیە سەرکەوتوەکانی ئەکرد.

لێرەدا بە پێی ئەم حاڵەتە بە ئاسانی دەتوانین درك بەوە بکەین کە چۆن کۆنگرەی ئاشتی گۆڕا بۆ کۆنرەیەکی داگیرکارانەی دڕندە، هەروەها چۆن بە بێ دودڵی لەسەر تەواوی بڕیارەکان ڕازی بو کە ئامانج و دەرەنجامەکانی ترسناك بون. ئەوەش کە پەیوەندی بە فەڵەستینەوە هەیە پرۆژەی چاودێری کردنی ئینگلیز لە لایەن چەند گەورە زایۆنیەکی جیهانیەوە دانرا کە لە سەروویانەوە ئەم ناوانە بون:

– پرۆفیسۆر فیلیکس فرانکفۆرتەر کە دواتر بوە ڕاوێژکاری سەرەکی لە کۆشکی سپی لە سەردەمی فرانکلین ڕۆزفێلت.

– سێر هێربێرت سامویل.

– لوشیان وۆلف.. ڕاوێژکاری تایبەتی سەرۆك وەزیران ئینگلیزی لوید جۆرج.

کاتێکیش کە دانوستانە سەرەتاییەکان دەستی پێ کرد بۆ کۆنگرە، ڕاوێژکاری تایبەتی بەڕێز کلیمانسۆی سەرۆك وەزیرانی بەناوبانگی فەرەنسا کەسێك بو بە ناوی ماندڵ، ئەڵبەتە ئەم ناوە خوازراو بو بەڵام ناوە ڕاستەقینەکەی بریتی بو لە (ڕۆتشیڵد) کە یەکێك بو لە ئەندامانی خانەوادەی (ڕۆتشیڵد) و یەکێك بو لەڕاوێژکارە سەرەکیەکانی شاندی ئەمەریکی بەڕێز (مورگنتزاو)ی جولەکە. دواتر ئەم کەسە ئەبێتە وەزیری دارایی ئەمەریکا لەسەردەمی سەرۆك ڕۆزفێلت..

پێشتر وتمان کە سەرمایە دارە جیهانیەکان پەردەیان بە بێ ترس لەسەر ڕوی خۆیان لادا لە کۆنگرەکەدا، وەك ئاماژەیەك بەو حاڵەتە برگەیەك لەو کتێبە ئەهێنینەوە کە لە لایەن لوشیان وۆلفەوەوە نوسراوە بە ناونیشانی "چەند لێکۆڵینەوەیەك لەسەر مێژوی جولەکە" و لە پەڕەی ٤٠٨ دا هاتوە کە (لە کاتی واژۆکردن لەسەر پەیماننامەی ئاشتی ژمارەیەکی دیکە لە گەورە سیاسیە

جولەکەکان دەرکەوتن. هەروەها ئەم کەسانەش: لویس کاوتز لە فەرەنسا[٧٥] و سومینۆ لە ئیتالیا و ئەدفین کونتاکیۆ لە هندستان[٧٦] واژۆیان لەسەر کردبو.. ".

لێرەدا وتەی هەندێك لە گەورە بیریارەکانی ڕۆژئاوا ئەهێنینەوە کە بۆخۆی پەیاننامەیەکەی ئاشکرایە کە پێویستی بە ڕون کردنەوە نیە: مێژونوسی دیبلۆماسی ئینگلیزی بەناوبانگ "هارۆلد نیکۆلۆن" لە کتێبەکەی بەناونیشانی "دروست کردنی ئاشتی ١٩١٩-١٩٤٤" لە پەڕەی ٢٤٤ دا دەڵێت کە لوشیان زۆلف داوای لێکردوە کە بێتە سەر ئەو بۆچونەوەی ئەو لەسەر ئەوەی کە "جولەکە پێویستە لە جیهاندا بپارێزرێن و لە هەمان کاتدا پێویستە تەواوی مافە هاوڵاتی بونیان هەبێت لە هەر دەوڵەتێك دا".

نوسەری فەرەنسی جۆرج باتۆ لە کتێبەکەی بە ناونیشانی "پرسی جولەکە" لە پەڕەی ٣٨ دەڵێت کە "بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەر شانی جولەکە ئەوانەی کە نزیك بون لە سەرۆکی ئەمەریکی ویڵسن و سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لووید جۆرج و سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا کلیمانسۆ بۆ گۆڕینی پەیماننامەی ئاشتی بە سودی جولەکە.

لێرەدا پێویستە کە ئاماژە بە ڕوداوێکی دیار بکەین کەلە کاتی ئەو دانوستانەکان لە پاریس ڕوی دا لە ساڵی ١٩١٦، لەو ڕوداوەدا سەرۆکی ئەمەریکا ویڵسن سەرەتا کۆمەڵێك بیروبۆچونی ئایدیالی قبوڵکرد بەڵام لە ناکاو لە ٢٨ ئازاری ١٩١٩ بروسکەیەکی پێ گەیشت لە لایەن کەسێکەوە کەپێك هاتبو لە هەزار وشە، ئەو کەسەش یەعقوب شیف نوێنەری سوخورە جیهانیەکان بو کە پێشتر چەندین جار باسمان لێوە کردبو، ئەو بروسکەیە بۆچونی ئەو کەسانەی لەخۆگرتبو کە یەعوب شیف نوێنەرایەتی دەکردن لەسەر پێنج پرسی

---

([٧٥]) ئەم کەسە دواتر بوە پاڵەوانی ڕوسواییەکی دارایی گەورە کە بە هۆیەوە ناچار بو پاشەکشێ بکات لە ژیانی ئاسایی.

([٧٦]) تا ئەو کاتە هندستان داگیرگەیەکی بەریتانی بو.

جیهانی که ئەوانیش بریتی بون لە: پرسی فەڵەستین، قەرەبو کردنەوەی ئەڵمانیا، سیلیسیای سەرو، ناوچەی سار، ڕێڕەوی دانزینگ[٧٧].

هەر زوو سەرۆك ویڵسن هەڵوێستی گۆڕی و دانوستانەکان ئاقارێکی دیکەی بەخۆوە بینی... باڵوێزی ئەو کاتەی فەڕەنسا لە بەریتانیا کۆنت دی سان ئۆکلیر لەو کتێبە سیاسیەی کە نوسیبوی بەناو نیشانی (جنێف بەرەو ئاشتی) باس لەو ڕوداوە ئەکات و ئەڵێت: ئەو دەقانەی کەلە ناو پەیماننامەی ڤێرسای هەبون و پەیوەندی بە پێنج پرسەکەوە هەبو، لە لایەن یەعقوب شێف و هاو نەتەوەکەی دانرابو.

پرسی فەڵەستین یەکەمین شت بو کە ببوە جێگەی بایەخی پیلان گێڕان و هەر کە شانەکان توانیان بڕیاری چاودێری کردنی فەڵەستین لە لایەن بەریتانیاوە دەربکەن لە پەیماننامەی ئاشتی دا، تەواوی هەوڵیان چڕکردەوە لە خۆ ئامادە کردن بۆ بەرپاکردنی جەنگی جیهانی دووەم. هەر بۆیە تەواوی هەوڵی خۆی دا تا توند ترین و ستەمکارتین مەرد دابنێت لەسەر ئەڵمانیا تا تۆی کینە لەناو دڵی ئەڵمانیەکاندا بچێنێت و بیکاتە ئامانجی نەتەوەیی بۆ تۆڵە سەندنەوە.. ئەمە هەر ئەوەش بو کە ڕوی دا.

پیلان گێڕان ئەوەشیان لە یادنەکرد کە ئاوڕێکیش لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بدەنەوە، ئەو کۆمەڵەیەی کە پەیماننامەی ڤێرسای بڕیاری دروست کردنی دابو، هەر بۆیە هەر لە سەرەتای دروست کردنیەوە سەرچاوەکانی خۆی نارده ناو ئەو کۆمەڵەیەوە تا بیکاتە داردەستێك بەدەست سوخۆرە جیهانیەکانەوە، ئەمەش هەر ئەو شتە بو کە (ناحوم سوکولوف) کە زایۆنیەکی ناسراو بو و سەرۆکی لیجنەی جێبەجێکاری کۆنگرە بو، ڕایگەیاند لە ٢٥ ئابی ١٩٥٢ و وتی کە کۆمەڵەی نەتەوەکان بیرۆکەی جولەکە بو... کۆلۆنێلی ئەمەریکی ئ.هـ. لین ئەم بیرۆکەیە وەر ئەگرێت لە کتێبەی کە بەناونیشانی (دەستی شاراوە) بڵاوی

---

(٧٧) دواتر جەنگی جیهانی دووەم لە کێشەی ڕێڕەوی دانزینگەوە دەست پێ ئەکات.

ئەکاتەوە و لە پێی ئەم کتێبەوە ئەیەوێت کە گەلی ئەمەریکا ئاگادار بکاتەوە لە مەترسی زایۆنیزم.

لێرەدا بە شێوەیەکی تایبەت سەرنجی ئەو وتەیە ئەدەیت کە یەکێك لە بە ئاگاترین کەسەکانی جیهان ئەیکات کەئەویش بێ گومان سەرۆکی دەستەی نوسەرانی ڕۆژنامەی (تایمز)ی ئینگلیزییە ئەویش ویکهام ستیدە، ئەم کەسە چەندین جار ئاماژەی بە هەژمونی شاراوەی سەرمایە دارە جیهانیەکان کردوە و لەو بارەیەوە ئەم بۆچونەی دەرکردوە لە پەڕەکانی ٣٠١ - ٣٠٢ ی کتێبە گەورەکەی کە بە درێژایی سی ساڵ نوسیویێتی:

من زۆر بە شێوەیەکی تایبەت پێداگری ئەکەم لە وتنی ئەوەی کە ئەوانەی کۆنترۆڵی پرسە جیهانیەکانیان کردووە، خاوەن سەرمایە جیبهانیەکانن و هەر ئەوانیشن کە ڕوداوەکان بە شێوەیەکی تایبەت ئەجوڵێنن.

لە کاتی کۆنگرەی ئاشتی، تەنها خەمی یەعقوب شێف و کۆمەڵەی واربۆرگ و هەندێك لە سەرمایەدارەرکانی دیکە ئەوەیە کە هەژمونی جولەکە مسۆگەرر بکەن بەسەر ئەوروپا بە شێوەیەکی گشتی و ئەڵمانیا بە شێوەیەکی تایبەتی.. [٧٨] کاتێکیش کە ونستۆن تشێرشل سەردانی فەڵەستینی کرد لە ساڵی ١٩٢١، لیجنەیەکی عەرەبی هاتنە پێشوازی و ئەو ستەمانەیان بۆ خستە ڕو کە دوچاری عەرەب ئەبێتەوە و ترسیشیان لەو ئامانجە باسکرد کە زایۆنیزم کاری بۆ ئەکات کە ئەویش دەست گرتنە بەسەر فەڵەستیندا، هەروەها ئەوەشیان ڕون کردەوە کە عەرەبەکان ئەوە بۆ هەزار ساڵە کە لە سەر ئەو خاکە ئەژین، دواجار داوایان لە تشێرشل کرد کە دەسەلاتی خۆی بەکار بهێنێت بۆ لابردنی ئەو ستەمە، ئەویش لە وڵامدا وتی: ئێوە داوای ئەوەم لێ ئەکەن کە دەست بەرداری بەڵێن نامەی بلفۆڕ ببم و کۆچی جولەکەکان ڕابگرم.. ئەمە لە توانای مندا نیە و ڕازیش نیم لەسەری، بەڵکو ئێمە پێمان وایە کە – بە پێی بەڵێن نامەی بلفۆڕ –

---

([٧٨]) تێبینی نوسەر: هەوڵەکانی بەڕێز ویکهام ستید بۆ ئاشکراکردنی دەستە شاراوەکان، یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانە بو کە پاڵی بەمنەوەنا تا لە لێکۆڵینەوەکانمدا بەدوای وەڵامی ڕاستیدا بگەڕێم.

ئەوە بۆ چاکەی جیهان و جولەکە و ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا و خودی عەرەبەکانە .. !! و ئێمە کار ئەکەین بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە.

ئەو کاتە کەس لە مانای قوڵی ئەو وشانە تێنەگەیشت کە پلانێکی شاراوەی جولەکە هەیە کە هەر لەو کاتەوە پەیوەندی بە تشێرشلەوە هەیە، بەڵکو من بۆخۆم – نوسەر – دوای تێپەڕ بونی چەندین ساڵ بەوەم زانی، بەتایبەت لە ساڵی ١٩٤٥ کاتی سەردان کردنی تشێرشل بۆ ئەمەریکا کاتێك کەلەگەڵ بێرنارد باروخ کۆبۆوە، ئەو جولەکەیەی کە سیاسەتی ئەمەریکای لە ژێر پەردەوە و بۆ چەندین ساڵ ئاڕاستە ئەکرد و دەستە ڕاستی سەرۆك ڕۆزفێلت و ڕاوێژکارەکانی بو، لەو کۆبونەوەیەدا دەڵێت: "من زایۆنیم و هەمیشەش زایۆنی بوم". ڕەنگە کاتێك کە بۆچونی خۆی بە ئاشکرا دەردەبڕێت بۆ لیژنە عەرەبیەکە، بیر لەو هەڕەشەیە بکاتەوە کە حاییم وازیمان پیاوی دێرینی کۆمەڵەی پیلانگێڕان بەئاشکرا ئاڕاستەی ئینگلتەرای کرد، ئەو کەسەی کە بە ئاشکرا لە ژمارەی ٤ ساڵی ١٩٢٠ گۆڤاری "جودشە روفدیشا" بەئاشکر دەڵێت: ئێمە لێرە لە فەلەستین جێگیر ئەبین جا چ پێتان خۆش بێت یا نا، تەنها شتێك کە ئەتوانن بیکەن ئەوەیە کە کۆچەکەمان کەمێك خێرا یان خاو بکەنەوە، بەڵام باشتر وایە کە هاوکاریمان بکەن تا هێزەکانمان لەدژتان هەڵ نەگەڕێنەوە لەبەر ئەوەی ئێستا لەیەك سەنگەردایە لەگەڵتان و بە ئەندازەیەکیش بە هێزە کە ئەتوانێت ئەگەر بیەوێت جیهان وێران بکات.

ئەم هەڕەیەش بەتەنها نەبو بەڵکو هاوکات بو لەگەڵ هۆشدارێکی دیکە کە ئاڕاستەی جیهان کرا لەو کۆنگرە زایۆنیەدا کە لە بۆدابێست پایتەختی هەنگاریا لە ساڵی ١٩١٩ دا بەسترا، ئەم کەسە لەیەکێك لە وتارەکانیدا دەڵێت "ڕێکخراوەکەمان – ڕێکخراوی زایۆنی – لە دوای جەنگ کار ئەکات لەسەر ڕێکخستنەوەی جیهان لە دوای جەنگ، ئەوە ئێمە بوین کە کۆمەڵەی نەتەوەکانمان دروست کرد و کار ئەکەین لەسەر کەوتنە دوای دەسەڵاتی ڕێ نیشاندەر.. بەڵام ئامانج و ئەرکەکانمان پێشوەخت دیاری کراوە".

بەڵگە نامەیەکی دەزگای هەواڵگری کەنەدا:

ئەم بەشەم لە ساڵی ١٩٤٤ دا تەواو کرد دوای ئەوەی کە لێکۆڵینەوەم کرد لە تەواوی ئەو دۆکیومێنت و زانیارییانەی کە پەیوەندی هەبو بە دیڕەکانی پێشوترەوە، بەڵام دوای هەشت ساڵ و بە پێی ئەو پۆستەی کە هەمبو[٧٩] بەڵگە نامەیەکی زۆر ترسناك کەوتە بەر دەست "دەزگای هەواڵگری کەنەدا" و لێرەدا بەئەرکی خۆمی دەزانم کە چەند بەشێك لەم دەقە بخەمە بەردەست لەبەر بایەخەکەی:

– ئەم بەڵگە نامەیە پەیوەندی هەیە بە "لیژنەی بەپەلەی حاخامەکانی ئەورروپا" کەلە ١٢ کانونی دووەمی ١٩٥٢ لە بۆدابێست بەسترا و ئەوەی کە دێت کورتەیەکە لەو بەڵگە نامەیە کە چەند بەڵگە نامەیەکی تێدایە و دەتوانم بڵاوی بکەمەوە:

ڕاپۆرتێك لە ئەورروپاوە لەسەر ئەو کۆنگرە ناوازەیەی لیژنەی بەپەلەی حاخامەکانی ئەورروپا:

وتاری نهێنی حاخامی گەورە ئیمانوێل رابینۆفیتش: سڵاوێك بۆ ئێوە کوڕەکانم، بۆ ئەم کۆبونەوە تایبەتە بانگهێشت کراون تا هێڵە سەرەکیەکانی پەیڕەوی نوێی خۆمتان پێ ڕابگەیەنم کە ئەویش ئەو پەیڕەوێکە هەر وەك ئەزانن پەیوەندی هەیە بە شەڕی داهاتوەوە کە پلانە سەرەکیەکەمان وا ئەخوازێت بیست ساڵ دوابخرێت تا بتوانین ئەو دەستکەوتانە بەهێز بکەین کە لە دەرەنجامی جەنگی جیهانی دوەمەوە بەدەستمان هێناوە، ئەڵبەتە ئەم ڕێنماییە نوێیانە وا ئەخوازێت کە ئەم ماوەیە بۆ پێنج ساڵ کەمتر بکرێتەوە.

---

([٧٩]) نوسەر یەکێکە لەفەرماندە دەریاییەکانی کەشتی گەلی کەنەدا، دەزگای هەواڵگری دەریایی کەنەداش سەر بەو هێزە بوە.

پێویستە پێتان پێ ڕابگەیەنم کە ئەونامانجەی تا ئێستا کاری لەسەر ئەکەین بە درێژایی سێ هەزار ساڵ ئێستا لەبەر دەستمانە و وانەخوازێت لێمان کە دواجار بۆ چنینەوەی بەرهەم پێویستە هەوڵەکانمان بەهێندە بکەین و هەرچی توانا و بەهرە هەیە بیخەینە پێناویەوە. هەروەها ئەتوانم جەخت لەوە بکەمەوە بۆتان ئێستا کە چەند ساڵێك تێ ناپەڕێت بەسەر ئەوەی کە ئیدی گەلەکەمان پێگەی یەکەمی بەدەست ئەهێنێتەوە لە نێو گەلاندا، ئەو پێگەیەی کە لێی زەوت کراوە بە درێژایی چەند نەوەیەك، بەو شێوەیەش کارەکان ئەچنەوە سەر ڕێچکە و سروشتی خۆیان و هەر جولەکەیەك دەبێتە سەروەر و هەر جوییمێکیش دەبێتە کۆیلە (چەپلەیەکی گەرم لێ ئەدرێت).

لێرەدا کورتەیەکتان ئەدەمێ لەسەر ڕێنماییەکانی جەنگی داهاتو: ئێوە سەرکەوتنی ئەو پەیڕەوەتان ئەکەوێتەوە یاد کە لە ساڵی ١٩٣٠ ەوە پیادەی دەکەین و سەرکەوتنی تەواوەتی بەدەست هێناوە، هەڵمەتی پڕوپاگەندەی بەرفراوان توانی کینە لە ئەڵمانیا دروست بکات لە دژی ڕۆژئاوا و جولەکە دواتر لە ڕۆژئاواش کینەو ڕقی لەدژی گەلی ئەڵمانیا دروست کرد بەهۆی ڕقی ئەڵمان لە جولەکە.

ئەمە هێڵی سەرەکی پەیڕەوی ئێستامانە و جێبەجێی ئەکەین، ئێمە هەڵمەتێکی کینە و ڕق لە ڕۆژهەڵات لە دژی ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوا لەدژی ڕۆژهەڵات دەست پێئەکەین و جەنگ لەگەڵ ئەو وڵاتانە ئەکەین کە هەوڵ ئەدەن بە بێ لایەنی بمێننەوە و ناچاریان ئەکەین کە پەیوەست بن بەم یان ئەو سەبازگەوە.. ڕێگە بەکەسیش نادەین کە ڕوبەڕومان بوەستێتەوە و لە توندی ململانێکە کەم بکاتەوە[80].

---

([80]) ئەم وشانە لە ساڵی ١٩٥٧ دا نوسراوەتەوە، لە ساڵی ١٩٦٣ کەنەدي سەرۆکی ئەمەریکا کوژرا لە هەل و مەرجێکی ئادیاردا کە هەموان دەیزانن و تا ئێستاش بە ناڕونی ماوەتەوە. ئەلبەتە سەرۆکی یەکێك لە هەردو دەوڵەتە بەهێزەکەی جیهانە. زۆر لایەن بە ئاشکرا یان بە ئاماژە ڕایان گەیاند کە هێز گەلێکی شاراوە هەیە کە لە تاریکدا کار ئەکات و بەرپرسیارە لەو کوشتنە. ڕونە کە سیاسەتی (جۆزن فۆستەر دالاس) لەسەر بنەمای ململانێ و توندوتیژی و هەڕەشەی جەنگ بەردەوام ناسراوە تەنانەت ناوی لێنراوە سیاسەتی (لێواری جەنگ). کاتێك کە کەنەدي ئەم سیاسەتەی قڵپ کردەوە و سیاسەتی پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی پەیڕەو کرد لەگەڵ

ئامانجی یەکەمی ئەم پەیڕەوە بریتی دەبێت لە بڵاو کردنەوەی گیانی عەسکەرتاری و شەڕکردن لە ئەمەریکا بەڵام پرۆژەی ئەو یاسایەی کە خرایە بەردەم کۆنگرێسی ئەمەریکا بە پشتیوانی ئێمە و بریتی بو لەوەی کە مەشقی سەربازی گشتنادنی بۆ بکرێت بەسەر تەواوی گەلی ئەمەریکا ڕەت کرایەوە، بەم شێوەیە ئێمە بە شێوەیەکی کاتی شکستمان هێنا بەڵام دوبارە هەوڵ دەدەینەوە و کار ئەکەین لەسەر لکاندنی تۆمەتی دژایەتی کردنی جولەکە بە گەلی ڕوسیاوە، هەروەك چۆن پێشتر ئەم کارەمان لەگەڵ گەلی ئەڵمانیادا[٨١] ئەنجامدا.. بە پارە و دەسەڵاتیش پشتوانی لەو ڕێکخراوانە ئەکەین کە بە شێوەیەکی تایبەت پشتیوانی لە جولەکە ئەکات لە ئەمەریکا.

بەڵام ئامانجی کۆتایی ئەم پلانە بێ گومان جەنگی جیهانی سێهەم دەبێت کە لە چاو جەنگەکانی پێشوتردا وێرانکەر ترە.. هەروەها کار ئەکەین لەسەر دروست کردنی ئیسرائیلێکی بێ لایەن لەم شەڕەدا تا ڕزگاری ببێت لە دەرەنجامەکانی و ببێتە پارەگایەك بۆ لیژنەکانی چاودێری و بەڕێوەبردن و ئەمەش وای لێ ئەکات کە سەرپەرتی پرسەکانی گەلانی دیکە بکات... ئەم شەڕە دوای شەڕی ئێمە دەبێت لە ململانێی مێژویی ئێمە لەدژی جولەکە.. ئەوکاتە ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆمان دەردەخەین و نیشانی جیهانی دەدەین.

پرسیارێك لە یەکێك لە حاخامە ئامادەبوەکان: دواکارم لە حاخام رابیتوفتش کە وەڵامی ئەم پرسیارەم بداتەوە: چارەنوسی ئاینەکان چییە لە دوای جەنگی جیهانی سێهەم؟

---

سەربازگەی یەکێتی سۆڤێت و وڵاتە ئازاد و بێ لایەنەکان، کوژرا و سنورێك دانرا بۆ ئەو سیاستە. ئەو هەواڵانەی کەلە ئەمەریکاوە بەدەست گەیشتون و تایبەت بە هەڵمەتی هەڵبژاردنی سەرۆکی داهاتو ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن کە ئەو هێزانەی کە مەیلیان هەیە بۆ شەڕ هەڵبژاردنەکان ئەبەنەوە.. ئێمەش لێرەدا هەرئەوەندەمان بۆ ئەکرێت کە دوبارە چاوێك بخشێنینەوە بە وتەکانی حاخام رابینۆفیتش لەبەر ئەوەی ڕەنگە بتوانین هۆکارەکانی کوشتنی کەنەدیمان بۆ دەر بکەوێت.

(٨١) ستونەکانی ڕۆژنامەکانی جیهان لەم ڕۆژەدا پڕیەتی لەو هەواڵ و وتار و تێبینیانەی کە باس لە چەوساندنەوە و ئازارەکانی جولەکە ئەکات لە ڕوسیا.

حاخام رابیتوفیتش: لەدوای جەنگی جیهانی سێهەمەوە نە ئایین و نە پیاوی ئایین هیچیان نامێنێت، بونی ئاین و پیاوانی ئاین مەترسین بۆسەر ئێمە.. ئەو هێزە ڕۆحییەی کە لە دڵی موسوڵمانەکاندا بڵاوی ئەکاتەوە... بوێریان پێ ئەدات تا ڕوبەڕوی ئێمە بوەستنەوە.. ئەڵبەتە ئێمە تەنها ڕوکەشی دەرەکی ئاینی جولەکە ئەمێڵینەوە تەنها بۆ یەك مەبەست ئەویش پاراستنی پەیوەندی نێوان ئەندامانی گەلەکەمان و ڕێگری کردن لەهەر بێ گانەیەك کە بێتە ناومانەوە لە ڕێگەی هاوسەرگیریی و شتی دیکەوە.

لە پێناو ئامانجی کۆتاییماندا پێویستمان بە دوبارەکردنەوەی هەمان ئەو پرۆسە ناخۆشەیە کە لەسەردەمی هیتلەردا پێی هەڵسابین، واتە ئێمە خۆمان هەڵدەستین بە ئەنجامدانی هەندێك کاری چەوساندنەوە لەدژی گەلەکەی خۆان؟ بە واتایەکی دیکە هەندێك لە ئەندامانی گەلەکەمان ئەکەینە قوربانی لە ڕوداوگەلێك دا کە خۆمان دورستی ئەکەین و لە پشت پەردەشەوە ئاڕاستەی ئەکەین تا لەو ڕێگەیەوە بتوانین بەهانەی پێویست بۆ پشتیوانی و هاوسۆزی گەلانی ئەوروپا و ئەمەریکا و تەواوی جیهان لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ ئەو دادگاییانەی کەلە دوای جەنگەوە ئەنجام ئەدرێت بۆ لە سێدارەدانەکانی ئەو سەرکردە سەربازیانەی کەلە دژی یەکدی ئەجەنگێن هەروەك ئەوەی کەلە دادگاییەکانی نۆرمبێرگدا کردمان[٨٢].

ڕەنگە قوربانی دان بە چەند هەزارێك لە گەلەکەمان و دواتر لکاندنی تۆمەتی لەناو بردنیان بە کەسانی دیکە قوربانی دانێکی گەورە بێت، بەڵام ئێمەنابێت قورسایی دابنێین بۆ هەر قوربانیەك کە دەیدەین لە پێناو ئامانجی کۆتاییماندا کە ئەویش بریتیە لە دەست گرتن بەسەر جیهاندا.

(٨٢) مەبەست لەو دادگاییانەیە کە لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە ئەنجامدرا لە نۆرمبێرگ و تیایدا هەندێك لە تاوانبارانی جەنگ و کەسایەتی دیاری ئەڵمانی تێدا لە سێدارە درا. تاوەکو ئێستاش دادگاییەکانی "تاوانبارانی جەنگ" ئەنجامئەدرێت لە وڵاتگەلە جیاوازەکانی ئەوروپا، هێزە زایۆنیەکانیش ئەوەکەنە پاساوێك بۆ ترساندنی لایەن و کەسەکان ئەوانەی کەلە بەرامبەر هەژمونی زایۆنیزم لە ڕۆژئاوا دەوەستنەوە.

ئێوە سەرکەوتنی کۆتایی ئەبینن کە وەك ڕوناکی لەپێش چاوتاندا ئەدرەوشێتەوە، دوای ئەو کۆنگرەیەش ئەچنەوە ناوچەکانی خۆتان تا دەست بەکار ببنەوە بە بێ وەستان تا ئەو ڕۆژە دێت کە ئیدی ئیسرائیل نەخشەی خۆی ئاشکرا ئەکات کە: ئیسرائیل ئەو ڕوناکیەیە کە جیهان ڕوناك ئەکاتەوە... و پێگەی کۆمەڵەی هەڵگرانی ڕوناکی[٨٣] دەبێت...

لێرەدا وتەی حاخامەکە تەواو ئەبێت و ئیدی ناتوانین زیادتر لە سەر ئەو کۆنگرەیە بدوێین، بەلأم ئەبێت ئاماژە بەو وتارە بدەین لەبەر ئەوەی زانیاری و بەرەنجامەکانی ئێمە ئەسەلمێنێت لەمەڕ دوژمنایەتی کردنی جولەکە و نازیزم...

لێرەدا بە شێوەیەکی یەکلا کەرەوە جەخت لەو هێزانەی ئەکاتەوە کە ئاڕاستەی زایۆنیزمی ئەکات و بەکاری ئەهێنێت و دەڵێت هەر هەمان ئەو هێزەیە کە ژایەتی جولەکە ئەکات و بەکاری ئەهێنێت هەروەك چۆن کە نازیزم هیتلەری بە زیرەکی بەکارهێنا. هەروەها ئەوە هەر خۆشیانن کە کار ئەکەن لەسەر هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی سێهەم، ئەو کەسەی کە ئاگادار ئەبێت ڕەنگە سەری بسوڕمێنێت کاتێك ئەبیستێت ئەوە سوخۆرە جیهانیەکان بون کە نازیزم بە ئاشکرا دژیاتی ئەکردن، بەلأم ئەو زانیارییانەی کە پێشتر باسمان لێوەکرد و لە دواتریشدا دێینەوە سەری ئەو هۆکارەمان بۆ ڕون ئەکاتەوە کە پاڵی بە ستالین و ڕۆژئاواوە نا تا پێکەوە بێدەنگی هەڵبژێرن لە بەرامبەر خۆ

---

(٨٣) وشەی هەلگرانی ڕوناکیمان بەکار هێناوە.و بە لاتینیش پێی دەوترێت (نورانیەکان).

پرچەك كردنی ئەڵمانیا كەلەیەك كاتدا هەڕەشەی لە هەردولا دەكرد، كارەكە لەوە زیادتر تێپەڕی كاتێك كە ڕێككەوتنێكی سەربازی لە نێوان هیتلەرو ستالین هاتە ئاراوە سەرباری ئەوەی كە سوپا هێشتا وەك پێویست مەشق پێكراو و ڕێكخراو نەبو . لە هەمان كاتدا بانكە ڕۆژئاواییە گەورەكان كەوتنە پشتیوانی كردنی پیشەسازی جەنگی سوپای ئەڵمانیای تازە پێگەیشتو بە پێدانی قەرزی گەورە و ئاسانكاری كردن لەو بارەوە.

كەس ناتوانێت بڵێت كە وڵاتانی ڕۆژئاوا ئاگاداری ئەوە نەبون كەلە پشت پەردەوە ڕوی دەدا لە ئەڵمانیا لە ڕوی گەشە كردنی هێزی سەربازیەوە. من ئەتوانم ئەم زانیارییە پشت ڕاست بكەمەوە لەبەر ئەوەی من خۆم ئەو ڕاستیەم زانی كاتێك كە هاتم بۆ بەریتانیا بە پێی ئەرك و پۆستەكەم لە ساڵی ١٩٣٠ لە كاتی بەستنی كۆنگرەی چەكی دەریایی.

شرۆڤەیەكی وردی ئەو قۆناغە لە مێژوی هاوچەرخ ١٩٢٠-١٩٣٨ دەریدەخات كە سوخۆرە جیهانیەكان كارەكانیان ئاڕاستە كرد بەمەبەستی گەیشتن بەم ئامانجانەی لای خوارەوە:

١. هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم بە پێی پلانە سەرەكی و درێژ خایەنەكەیان، لەو كارەشدا سەركەوتنیان بەدەست هێنا.

٢. گۆڕینی ئەو دەسەڵات و سیستەمانەی كە دژایەتی دەكردن لە ئەوروپا، لەو كارەشدا سەركەوتنیان بەدەست هێنا، وەك خستنی دەسەڵاتەكەی ئاسكویت لە بەریتانیا لە كاتی جەنگی جیهانی یەكەم.

٣. ناچاركردنی بەریتانیا و فەرەنسا و دواتر ئەمەریكا بە قبوڵكردن و پشتیوانی كردنی دروست بونی دەوڵەتێكی نیشتیمانی بۆ جولەكە لە فەلەستین. حكومەتی بەریتانیا لەكاتی جەنگی جیهانی یەكەم پەیوەست بو بە سوخۆرە جیهانیەكانەوە لە بەرامبەر بەڵێن دانی ئەوان بە فەرمان دان بە ڕێكخراوەكانیان تا وا لە ئەمەریكا بكەن ناچار بێت و بەشداری شەڕ بكات شان بە شانی هاوپەیمانەكان.. دەزگای هەواڵگری دەریایی بەڵگەی لەلایە كە

ڕوداوی ژێر ئاوکەوتنی کەشتی ئەمەریکی لە لەویزیتانیا[٨٤] لە لایەن هێزی دەریایی ئەڵمانیاوە ڕوداوێکی دروست کراوبو... هەروەك ڕوداوی پرل هاربەر[٨٥] لە ساڵی ١٩٤٩ کە بوە هۆی بەشداری کردنی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە شەڕ لە دژی یابان.

بەڵگەنامەی ئینتدابی ئینگلیز لەسەر فەڵەستین:

ئەو دەقە سەرەکیەی پەیماننامەی ڤێرسای لەمەڕ ئینتدابی ئینگلیز لەسەر فەڵەستین ئەم بڕگەیە لەخۆ ئەگرێت:"... بۆ ئەوەی فەڵەستین بکرێتە نیشتیمانێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە" ئەڵبەتە زایۆنیەکان ئەو دەقەیان گۆڕیوە بەو ئامانجەی کەبتوانن بەرژەوەندیە ڕاستەقینەکانیان بشارنەوە هەر بۆیە بەم شێوەیەی لێهات:

"ئەویش بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی جولەکە بۆ فەڵەستین" ڕونە کە ئەم چاککردنە بۆ ئەوەبو وا نیشان بدرێت کە جولەکە مەیلی ئەوەی نیە بە تەواوەتی دەست بگرێت بەسەر فەڵەسیندا...

بە پێی ئەوەی کە خرایە ڕو دەرکەوت کە چۆن پیلانگێڕان توانیان ئاڕاستەی سیاسەتی ئەورویا بکەن بە تەواوەتی لە نێوان هەردو جەنگی جیهانیدا، ئەم سیاسەتە ناسراوەتەوە بە چاوبڕینە سەروەت و سامانی گەلان و داگیر کردنی وڵاتان بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە سەرباری دابەش بونی ئەورویا بەسەر دو سەربازگەدا کە زۆری نەخایاند تا بەیەکیاندا کێشا لە جەنگی جیهانی دووەمدا.

---

[٨٤]) ئەم ڕوداوە هۆکاری ڕاستەوخۆ بو لە توڕەکردنی گەل ئەمەریکی لە ساڵی ١٩١٧ و هەر بەو هۆیەوە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بڕیاری دا کە شەڕ دژی ئەڵمانیا ڕابگەیەنێت.

[٨٥]) ئەو ڕوداوە بەناوبانگە بو کە وای لە ئەمەریکا کرد لەدژی یابان بەشداری شەڕ بکات. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤ یابان لە ناکاو پەلاماری ئەم بەندەرەی ئەمەریکایدا لە دورگەکانی (هاوای) لە ئۆقیانوسی هادی.

پێویستە ئەوەمان لەیاد بێت کە یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی پیلانگێڕان لە جەنگ دروست کردنی دەوڵەتێکی تایبەت بو بە زایۆنیزم تا ببێتە بنکەیەکی سەرەکی بۆ ئەو خراپەیەی کە تەواوی وڵاتانی جیهان دەکاتە ئامانجی خۆی.

## بەشی نۆهەم

# ستالین

ستالین لە ساڵی ١٨٧٩ لە گوندێکی شاخاوی بە ناوی "گوری" لە دایك بو لە هەرێمی جۆرجیا (ناوی ڕاستەقینەی فیساریۆنۆفیتش جوگاشڤیلی بو) لە دایکێکی زۆر ئیماندار کە ناوی "ئیکاترینا گیلا گیلادز" باپیرەکانیشی کۆیلەی زەوی بون لە گوندی فامبارولی.

باوکی ستالین ئێمە هیچی لە بارەوە نازانین جگە لەوەی کە بە درێژایی ژیانی کاری جوتیاری کردووە دواتر لە کارخانەی پێڵاو دروست کردن کاری کرد لە شاری ئەدیلخانۆف و بۆچون وایە کە بەردەوام کەسێکی سەرخۆش و بەد خوڵق بوە بە پێچەوانەی دایکی کە ناچار بوە وەك جل شۆر کار بکات تا هەندێك پارە پاشەکەوت بکات و ئاواتی گەورەی بهێنێتە دی کە بریتی بو لەوەی کە ڕۆژێك بێت کوڕەکەی ببێتە قەشە. هەر بۆیە ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دا تا بینێرێتە قوتابخانە لە "گوری" و دواتر دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا کەلە پەیمانگەیەکی ئاینی بخوێنێت لە شاری تفلیس بەڵام دەرکەوت کە ئەو بۆ ژیانی ئاینی دروست نەبوە لەبەر ئەوەی ئەو هەمیشە لە ناکۆکی دا بوە لەگەڵ دەسەڵاتەکانی پەیمانگا تا کار گەیشتە ئەوەی لەدوای تێپەڕ بونی چوار ساڵ دەرکرا و پەیوەندی کرد بە یەکێك لە کۆمەڵە شۆڕگێڕیەکانی ئەو کاتە لە ڕوسیا.

ستالین بۆیەکەمین جار هاوسەگیری لەگەڵ "نیکاترینا سفایندز" کرد کە منداڵێکی بۆ هێنایە بون بەناوی "یاشا" کە بەدرێژایی ژیانی کەسێکی فەرامۆشکراو بو، تەنانەت ئەو کاتەش کە باوکی بوە کەسێکی دیکتاتۆر و دەستی گرت بەسەر نیوەی گۆی زەوی دا ئەو وەك کەسێکی کارەباچی و میکانیکی کاری ئەکرد. ستالین بۆ دوومین جار هاوسەرگیری لەگەڵ "نادیا ئالیلیرفا" کرد کە ئەویش دو منداڵی بۆ هێنایە بون کە یەکێکیان کوڕ بو ناوی ڤاسیلی بو و ئەوی دیکەشیان کچ بو و ناوی سفیتلانا بو. ڤاسیلی دواتر بو بە جەنەڕاڵ لە هێزی ئاسمانی یەکێتی سۆڤێت و هەرئەویش بو کە سەرپەرشتی نمایشە ئاسمانیەکانی ئەکرد، دوای مردنی باوکی ئەویش لە یادکرا و لەبیرچۆوە.

هاوسەرگیری دووەمی ستالین سەرکەوتو نەبو لەبەر ئەوەی کە چاوی کەوت بە ئافرەتێکی جولەکەی سەرەنج ڕاکێش بەناوی روزا کانمنوفیتش و بۆ ماوەیەك وەك هاوسەر لەگەڵی دا ژیا بەڵام ئەوەندەی نەبرد کە نادیا خۆیکوشت. هەر وەك دیارە کە خۆکوشتنی هاوسەرەکەی پەیوەندی بە چیرۆکێکی خۆشەویستی یەوە نیە بەڵکو بەهۆی ئەو خەمە زۆرەوە بو کەتوشی هات لەدەرەنجامی ئەو توندوتیژییەی کە هاوسەرەکەی ئەنجامیدا لە دژی نەیارەکانی کە نادیا پێی وابو لە ڕوی ئاینییەوە برای ئەون.

ڕۆزا کانمافوفیتش خوشکی لازار کانمافوفبیتشە کە سەرکردەیەکی کۆمۆنیستی بەناوبانگ بو لە سەردەمی ستالین و ئەندام بو لە مەکتەبی سیاسی (پۆلیتبرۆ) پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤێت، ستالین ڕۆڵی سەرکردایەتی لە شۆڕشدا پێ بەخشی و کردیە سەرپەرشتیاری پیشەسازی قورس. دواتر بوە کەسێکی زۆر نزیك لە ستالین تا کاتی مردنی و هاتنی سەرۆکی نوێی یەکێتی سۆڤێت کە خرۆتشۆف بو، بە هاتنی خرۆتشۆف بەرکەنار کرا لە کاری سیاسی... ناوبراو توانی کە کچەکەی ستالین سفتلانا لە کورەکەی خۆی میخائیل مارەبکات لە ١٥ تەموزی ١٩٥١ . لە ڕاستیدا سفتلایا هاوسەری کەسێکی دیکە بو کە بڕیار لەسەر ئەم هاوسەرگیرییە درا و کەسیش هیچی

لەبارەی هاوسەری یەکەمەوە نەبیست جگەلەوەی کە لە ناکاو لەسەر ڕێگە لادرا.. هەروەك چۆن کە ستالین ڕۆزا کنمافوفیتشی هێنا دوای ئەوەی کە هاوسەری دووەمی لە ڕێگەی خۆکوشتنەوە لەسەر ڕێگە لابرا...

ڕاستی گەلێکی سەرنج ڕاکیش:

بەم شێوەیە ستالین ئەژیا لە خێزانێکی نیمچە جولەکەدا: هاوسەرەکەی جولەکە بو و هاوسەری کچەکەشی جولەکەبو و هاوڕێ نزیکەکەشی برای خێزانەکەی بو کە ئەویش جولەکە بو.. ئەمانە ڕاستی گەلێکی مێژویین کە ناکرێت مشت و مڕی لەبارەوە بکرێت.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە تەواوی ڕاستیەکە نییە لەبەر ئەوەی کە جێگری سەرۆك لە سەردەمی ستالین و وەزیری دەرەوەی کە ناوی مۆڵۆتۆف بو هاوسەرەکەی جولەکەبو و لەهەمان کاتدا خوشکی سەرمایەدارێکی ئەمەریکی گەورە بو بەناوی "سام کارب" کە خاوەنی کۆمپانیای مەزنی "کارب ئکسپۆرتینگ" بو کەلەبواری هێنانی کاڵادا کاری ئەکرد و نێوەندەکەی دەکەوتە ویلایەتی "کونیکتیکوف" لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا... کچەکەی مۆڵۆتۆفیش دەستگیرانی ڤاسیلی کوڕی ستالین بو.. بەم شێوەیە بە ڕونی دەردەکەوێت کە مەکتەبە سیاسیەکەی ستالین کە دەستی گرتبو بەسەر تواناو دارایی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤێت و جیهانی کۆمۆنیزم وەك خێزانێك وەهابو کە هاوسەر و کوڕەکان تیایدا جولەکە بون[٨٦]..

گومانی تێدا نیە کە ئەمە ڕۆشنایی ئەخاتە سەر لایەنە شاراوەکانی ئەو گۆڕانکارییە ڕیشەییانەی کە لە یەکێتی سۆڤێت ڕویان دا لە کاتی هاتنە سەرکاری خرۆتشۆف و بوە هۆی ئەوەی کە هەڵوێستی دوژمنکارانە وەربگرێت بەرامبەر بە هاوەڵە کۆنەکان و پاکتاو کردنی سەرکردەکانی دەوڵەت و پارتی

---

([٨٦]) لێرەوە دەردەکەوێت کە چۆن وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت هەر لە سەرەتاوە لە کێبڕکێی ئەوەدابون کە کامیان دان بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل دا بهێنێت.

کۆمۆنیستی و مەکتەبی سیاسی. هەربەوەش نوەستایەوە بەڵکو هەڵسا بە گۆشەگیرکردنیان لە ڕوی ژیانی سیاسی و پەردە لەسەر لادانیان لە بەرامبەر گەلی ڕوسیا و جیهان.

بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩١٧ دەرفەت بۆ ستالین ڕەخسا تا دەربکەوێت لەنێو شۆڕشگێڕەکاندا کە زۆربەیان لە ناو زیندان دا بون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی هیچ ڕۆڵێکی ڕێبەرایەتی وەربگرێت لەناو پارتی کۆمۆنیستی تەنها ئەو کاتە نەبێت کە لینین نەخۆش کەوت، دوای دروست بونی ململانێش لە نێوان خۆی و ترۆتسکی دا و دواتر بە پاکتاو کردنی توانی دەسەڵات بگرێتە دەست و تا کاتی مردنی لەو پۆستەدا بمێنێتەوە.

### قۆناغەکانی سەرکەوتن:

ڕەنگە لێرەدا پێویست بێت کە باس لە قۆناغەکانی سەرکەوتنی ستالین بکەین لەدەسەڵات دا. کاتێك کە لینین نەخۆش کەوت لە یەکی ئازاری ١٩٢٢، دەسەڵات بەخشرا بەهەر یەك لە ستالین و زینۆفیف و کامینیف، دوای ئەو ڕوداوەش ئەوەندەی نەخایاند کە لینین کۆچی دوایی کرد.

سەرکردایەتی مەکتەبی سیاسی ئەو کاتە پێك هاتبو لە هەر یەك لە لینین، زینۆفیف، کامینیف، ترۆتسکی، بوخارین، تۆمسکی و ستالین.

زینۆفیف و کامینیف دەستە ڕاستی لینین بون، ئەمەش وای لەو دو کەسە کردبو کە وەك ئەندامانی مەکتەبی سیاسی سەیری خۆیان بکەن. ترۆتسکی لە کتێبەکەی کە دواتر و لە ژێر ناوی ستالین چاپی کرد لە پەڕەکانی ٤٨ – ٣٢٧ دەڵێت: "زینۆفیف بە شێوەی سەرۆك و ژێر دەست مامەڵەی لەگەڵ ستالین ئەکرد، کامینیفیش بە شێوەیەکی گاڵتە جاڕیانە مامەڵەی لەگەڵ ستالین ئەکرد".

ئەم دوانە وەك ئەیاری سەرەکی بۆ دەسەڵات سەیری ترۆتسکیان ئەکرد لەدوای مردنی لینین، ئەو کاتە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی وا سەیری

زینۆفیفیان ئەکرد وەك تەنها كاندید بۆ سەرۆكایەتی کردنی مەکتەبی سیاسی، هەر بۆیە ئەرکی وتاردانیان پێدا لە کۆنگرەی دوانزەهەمی پارتی کۆمۆنیستی، ئەو ئەرکە تەنها لینین پێی هەڵ دەستا بەر لە مردنی، بەڵام هەر زو زینۆفیف لەو ئەرکەدا شکستی هێنا و بەمەش ستالین ئەو هەلەی قواستەوە و دەستی کرد بە بەڕێوە بردنی کۆبونەوەکان، کاتێکیش کە کۆنگرە کۆتای پێهات، ستالین توانی بوی کە پۆستی یەکەمی پارتەکە بۆ خۆی مسۆگەر بکات، دۆخەکە بەم شێوەیە مایەوە تا کاتی مەرگی لینین لە ساڵی ١٩٢٤.

دواتر ستالین لە نیسانی ساڵی ١٩٢٥ توانی کە ترۆتسکی کەنار بخات لە پۆستەکەی خۆی وەك نوێنەری گەل بۆ کاروباری بەرگری (وەزیری بەرگری)، دواتر دژایەتی هەر یەك لە زینۆفیف و کامینیفی کرد و لە بری ئەوان لەگەڵ بوخارین و ڕیکۆف و تۆمسکی یەکی گرت، بەمەش زینۆفیف و کامینیف لەگەڵ ترۆتسکی یەکیان گرت و بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆنیان لە دژی ستالین دروست کرد، بەڵام ئیدی ئەم هەنگاوە درەنگ بو... بەم شێوەیە ستالین توانی لە شوباتی ١٩٢٦ زینۆفیف لە مەکتەبی سیاسی دەر بکات و دواتر لە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤێت و سەرۆکایەتی ئەنتەر ناسیۆناڵی سێهەمیش دەری کرد، دواتر نۆبە هاتە سەر کامینیف و ترۆتسکی و لە ساڵی ١٩٢٦ ئەوانیشی دەری کرد لە مەکتەبی سیاسی، لە ساڵی دواتریشدا هەر سێ نەیارەکەی لە لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست دەرکرد و دواتر لەتەواوی پارتەکە دەری کردن... لە ساڵی ١٩٢٧ ترۆتسکی دوا هەوڵی دا بۆ ڕاپەڕین لە دژی ستالین و تاوانباری کرد بەوەی کە لە ئایدیۆلۆجیای مارکسیەت هەڵ گەڕاوەتەوە و دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری دامەزراندوە، وەڵامی ستالین بۆ ئەم تۆمەتانە زۆر توند بو و دەستی کرد بە هەڵمەتێکی پاکتاوکردنی گەورە کە تیایدا بە ملیۆنەها کەس گیانیان لەدەست دا و بە هەزارەها کەس ڕەوانەی سایبیریا کران... ئەڵبەتە ئەم ڕاستیانە دواتر لە لایەن خرۆشۆفەوە ئاشکرا کرا...

هەڵبگەڕێتەوە لەبەر ئەوەی شەڕ ئەورووپای خستە ژێر دەستی ئەڵمانیای هیتلەرەوە، بەم شێوەیە ئەڵمانەکان توانیان تەواوی تووڕەیی خۆیان بەسەر جولەکەکانی پۆڵۆنیا و بەلجیکا و فەڕەنسا و هۆڵەندادا بەتاڵ بکەنەوە.. لە کاتێکدا ئەگەر شەڕ نەبوایە ئەوان بێ وەی دەبون، بینیمان کە چۆن ئەو شەڕە سەرانی جولەکە کاریان بۆ ئەکرد لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە.. هۆکارێکی دیکە ئەوەیە کە دوژمنایەتی ئەڵمەنەکان بۆ جولەکە لە پێش جەنگ بریتی بو لە ڕق لێهاتنەوە و زیندانی کردن و دورخستنەوەی جولەکە، بەڵام دوای هەڵگیرساندنی جەنگ جولەکە لە سەرتاسەری جیهان لە دژی ئەڵمانیا وەسانەوە، دوای ئەوەش کە خوێنی سەربازە ئەڵمانیەکان ڕژا لە بەرەکانی جەنگ ئیدی ئەو دوژمنایەتیە زۆر پەرەی سەند بە وپێیەی کە ئیدی جولەکە بەو هەڵوێستەیان بونە دوژمنی هاوبەش لە شەڕ لە دژی ئەڵمانیا هەر بۆیە سروشتی بو کە ئەڵمانیا شەڕیان لەگەڵدا بکات و لێیان بکوژێت، ئەڵبەتە تەواوی ئەو گەلانەی کە بەشداری شەڕیان کرد لێیان کوژرا بگرە بە ملیۆنەها کەس لە ڕوس، ئینگلیز، ئەمەریکی و ئەڵمانەکان کوژران... بەم شێوەیە ئەبینین کە ئەوە سەرانی جولەکەی جیهانی بون کە پاڵیان بە جولەکەکانەوە نا تا بکەونە ئەم هەڵوێستە خراپەوە. ئەم حاڵەتەمان بە باشی لە حاڵەتی پۆڵۆنیادا بۆ دەر ئەکەوێت، پەیماننامەی ڤێرسای ململانێی نێوان ئەڵمانیا و پۆڵۆنیای کردە ڕاستی لەبەرئەوەی بە ڕێڕەوێك بروسیای ڕۆژهەڵاتی جیا کردەوە – کە هەرێمێکی ئەڵمانی بو – لە تەواوی ئەڵمانیا، بەپێی پەیماننامەی ڤێرسای ئەم شارە لە ئەڵمانیا جیا کرایەوە و کرا بە شارێکی نێو دەوڵەتی...

ئەو پڕپاگەندانەی کە سوخۆرە جیهانیەکان سەرپەرشتیان ئەکرد زنجیرەیەك درۆی دروست کرد تا ڕای گشتی پێی وابێت کە ئەوە هیتلەر بو کە ویستی بە زۆر پرسی دانزینگ چارەسەر بکات، بەڵام لە ڕاستی دا هیتلەر ویستی کە پرسی دانزینگ و ڕێڕەوی پۆڵندی بە شێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکات بە پێی ئەو یاداشتەی کە لە ئازاری ساڵی ١٩٣٩ دا ناردی بۆ پۆڵۆنیەکان و تیایدا بۆ دواجار داوا ئەکات کە ئەو پرسە بە شێوەیەکی دروستانە چارەسەر بکرێت

تا بکەنە چارەسەرێکی ئاشتیانە، پێشتریش چەند جارێک ویستبوی بکاتە رێکە چارەیەکی ئاشتیانە ئەمەش شتێکە کە ڕاگەیاندن باسی لێوە ناکات.. ئەم یاداشتەش بۆ ماوەی چەند مانگێک بە بێ وەڵام مایەوە، ئەڵبەتە حکومەتی پۆڵۆنیا بە مەبەست ئەو یادشتانەی پشت گوێ ئەخست ئەمەش وای کرد کە هیتلەر پشودرێژی خۆی لەدەست بدات و لە لایەکی دیکەوە ئەو پڕوپاگەندانەی ئەو ڕۆژنامانە بڵاو یان ئەکردەوە بەناڕاستەی جولەکەکان وایکرد دواجار لە مانگی ئەیلولی ١٩٣٩ پەلاماری پۆڵۆنیا بدات...

بەڵام ئەوەی کە وای لە حکومەتی پۆڵۆنی کرد کە یاداشتەکەی ئەڵمانیا پشت گوێ بخات، ئەو جەخت کردنەوانەی ئینگلتەرا بو کە دەیوت لە حاڵەتی جەنگدا دەیپارێزێت، هەر واشبو لە مانگی ئازاری ١٩٣٩ حکومەتی بەریتانیا یاداشتێکی واژۆ کرد و تیایدا بەڵێنی ئەوەی دا کە پۆڵۆنیا ئەپارێزێت.. ئەڵبەتە حکومەتی ئینگلیز لە ژێر گوشاری زۆری نهێنی و ئاشکرای سوخۆرە جیهانیەکان ئەو بەڵێن نامەیەیان دەرکرد . ڕەنگە پێمان وابێت کە بەریتانیا وادەکەی خۆی بردۆتە سەر بەڵام لە ڕاستیدا حکومەتی بەریتانیا دەستەوەستان بەو لەوەی کە هاوکاری پۆڵۆنیا بکات نە لە ڕێ دەریا و نە لەڕێ وشکایی و ئاسمان، بەمشێوەیە گرەنتی پشتوانی کردنی بەریتانیا شتێک نەبو جگە لە توش کردنی پۆڵۆنیا... سەرانی جولەکەی جیهانی باش ئەوەیان ئەزانی کاتێک کە بەریتانیایان ناچار کرد تا واژۆ لە سەر ئەو بەڵێن نامەیە بکات، هەر ئەوانیش بون کە هانی سەرانی حکومەتی پۆڵۆنیایان کرد تا هەڵمەتێکی توند بکەنە سەر ئەڵمانیا و دەشیان زانی کە بەریتانیا ناتوانێت هاوکاری پێش کەش بە پۆڵۆنیا بکات.. لێرەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەر دەکەوێت کە ئەو پش ئەوەیە: سەرانی جولەکەی جیهانی ئەم چارەنوسەیان بۆ هاو نەتەوەی خۆیان هەڵبژارد و بە نەخشەیەکی پێش وەخت پلان بۆ داڕێژراو پێشکەشی ئەڵمانەکانی کردن دوای ئەوە کە بەر لەوە هیتلەریان ناچار کرد کە بچێتە سەر باوەڕی سەرکردەکانی نازیزم ئەوانەی کە بە شێوەیەکی سروشتی ڕقیان لە جولەکە بو دوای ئەو هەڵوێستەی کە سەرانی جولەکە هەیان بو

بەرامبەر بە ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە.. ئەمەش بە شێوەیەکی یەکلا کەرەوە ئەوەمان بۆ دەر دەخات کە سەرانی جولەکەی جیهان هیچ نین جگە لە کۆمەڵێک چاوچنۆك کە ئەوە لە دوای ئەوە ئەو پلانە ئەهریمەنانەین بۆ دەمێنێتەوە کە بریتیە لە چەوساندنەوەی جیهان لە پێناو بەرژەوەندی خۆیاندا.. پێویستە تەواوی جولەکە ئەوە بزانێت کە تەنها ئەوە سەرکردەکانیان بەرپرسن لەو کارەساتانەی کە بەسەریاندا دێت بە درێژایی مێژو کە لێوان لێوە بە شەڕ و ناکۆکیان لەگەڵ تەواوی گەلاندا، هەروەها پێویستە ئەوە بزانن کە سەرکردەکانیان یاخود سەرانی زایۆنیزم یا نورانیەکان یان هەر ناوێکیان لیٚ ئەنێیت لە ڕاستیدا تا ئەمڕۆکە سەر بە هیچ ئایین و نەژادێك نین و باوەڕیان بە هیچ ئاینێك نیە جگە لە چاوچنۆکییەکی شێتانەی بۆماوە، هیچ ڕۆژێکیش هەر لە دێر زەمانەوە تا ئەمڕۆکە سڵیان لەوە نەکردۆتەوە کە جولەکە بخەنە ناو دژوارترین دۆخەوە تەنها لە پێناو بەرژەوەندی خۆیاندا. گەر ئامانجیان داکۆکیکردن بوایە لە جولەکە هەر وەك ئەوەی کە خۆیان باسی لێوە ئەکەن، کاریان ئەکرد لەسەر ئەوەی کە خۆیان لە جەنگ لابدەن و خۆشیان بەدور بگرن لە پاڵ نان بە پۆڵۆنیاوە تا بەشداری شەڕ بکات لەبەر ئەوەی ئەیانزانی کە چیان بەسەر دێت.

ڕەنگە هەندێك لەو جولەکانەی کە ستەمیان بەرامبەر کراوە بڵێن کە لە ڕێگەی ڕێکخراوی فەڵەستینی و تۆڕەکانییەوە دزەیان کردۆتە ناو ئەمەریکا و وڵاتانی ئەوروپا و فەڵەستینەوە، بەڵام لە ڕاستی دا جولەکە ئاساییەکان ئەوانەی کە بەفەرمانی سەرکردەکانیان کارئەکەن لەناکاو خۆیان لەناو جەنگدا دۆزییەوە، بەڵام خودی سەرۆك و نوێنەرەکانیان ئەوانەی کە بە کورتی هەستان بە ڕێکخستنی تۆڕەکانی تێك دان لە گشت شوێنێك و ئاسانکارییان کرد بۆ دورست بونی جەنگ، ئەوە هەر ئەوان بون کە دزەیان کردە ناو ئەوروپا و ئەمەریکا و فەڵەستینەوە، هەر ئەوانیش بون لە بەرامبەر گەلانی ڕۆژئاوا بەرگی کەسی ستەملێکراویان ئەپۆشی و وایان بانگەشە ئەکرد کە قوربانی دەستی چەوساندنەوە و ستەمن، لە کاتێك دا کە ئەوە هەر خۆیان بون کە ئەو

چەوساندنەوە و ستەمەیان ڕێك خست و دواتر هاتن لە ژێر ناوی زایۆنیزمدا بانگەشەیان کرد بۆ داکۆکی کردن لە گەڵی جولەکە.

ئەگەر جیهان بە ڕاستی بیەوێت کە داکۆکی لە جولەکە بکات، ئەوا باشترە کە ئەو کۆمەڵە تاوانبارە لەناو بەرێت.. ئەگەر جولە بیەوێت بە ڕاستی داکۆکی لەخۆی بکات،[٨٩] پێویستە سەرەتا جیهان ڕزگار بکەن لەو کەسانە و لەو کۆڕی ئەو خراپەیەی کە سەرۆکایەتیان ئەکات.

---

(٨٩) پێ ئەچێت هەندێك لە جولەکەکان لێرە و لەوێ هەستیان بە مەترسیەکردبێت هەر بۆیە دەستیان کرد بە دروست کردنی چەند کۆمەڵەیەکی دژ بە جولەکە بە تایبە لە ئەمەریکا کە بانگەشەی یەکخستنی ئەو جولەکانە ئەکات لە وڵاتەکانی خۆیاندا و کار ئەکات لەسەر قوتار بون لەدەست ئەو سەرکردانەی کە ناچارین کردون وەك کەمایەتییەکی دورەخراو ژیان بەرنە سەر.

# لایەنە سیاسیە شاراوەکانی جەنگی جیهانی دووەم

. ئینگلتەرا: تشمرلین و تشێرل
ئەڵمانیا: هیتلەر و نازیزم

لە سەرەتای ئەم بەشەدا وتمان کە چۆن دەستەبژێرێك لە ئینگلیزەکان هەڵبژێردران کە لە سەرویانەوە دۆمفیل و کۆلۆنێلْ ڕامزی کە ئامانجیان بریتی بو لە هۆشداری دان بە بە حکومەتی ئینگلیز لە مەترسی جوڵانەوەی جولەکەی جیهانی، کاتێك کە تشمبرلین سەرۆك وەزیرانی ئینگلیزی بەدەست هێنا، ئەمیراڵ دومفیل و ڕامزی ئەو ئەرکەیان لە ئەستۆ گرت کە لایەنە شاراوەکانی ڕوداوەکانی بۆ باس بکەن و پێی بڵێن کە سوخۆرە جیهانیەکان کار ئەکەن لەسەر هەڵگیرساندنی شەڕ لە نێوان ئینگلتەرا و ئەڵمانیا، هەروەها باسیان لەئامانجەکانی ئەو شەڕە کرد.. ئەوان پێویستیان بە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە بو تا تشمبرلین لەو ڕاستیانە ئاگادار بکەنەوە بەڵام لە کۆتاییدا توانیان کە ئاگاداری بکەنەوە لە سەرچاوەی مەترسیەکان.. بەم شێوەیە حکومەتەکەی هەڵوێستێکی وریایانەی گرتەبەر لە بەرامبەر قەیرانە سیاسیە جیهانیەکان و ئەوەی ڕەت کردەوە کە گوێ لە خواستی سوخۆرە جیهانیەکان وەربگرێت، تشمبرلین درکی بە نیەت خراپی پەیمان نامەی ڤێرسای کردبو، هەر بۆیە بڕیاری دا کە بە نەفەس درێژی تاوتوێی کێشەکان بکات، دەرەنجامی ئەوەش بوە هۆی ئەوەی کە سوخۆرە جیهانیەکان وەك دوژمن سەیری بکەن، کاتێکیش کە قەیرانی (سودیت) وروژا بەهۆی ئەوەی کە هیتلەر ئەو ناوچەیەی داگیر کرد

له بەر ئەوەی بە پێی پەیماننامەی ڤێرسای ئەو ناوچەیە لەئەڵمانیا جیاکراوەتەوە و خراوەتە سەر چیکۆسلۆڤاکیا، تشمبرلین پەنای نەبردە بەر ڕاگەیاندنی جەنگ بەڵکو پێی باشتر بو کە بانگەشە بکات بۆ بەستنی کۆنگرە بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە بە تایبەت لە بەر ئەوەی ئەو زانیارییانەی کە ئەمیراڵ دومفیل و ڕامزی پێیان دابو بە ئاگایان هێنابو لەو پلانەکانی سەرانی جولەکە. هیتلەریش خواستی کەمتر نەبو لە بەریتانیا هەروەك چۆن دواتر دێینە سەری، بەڵام ئەو سور بو لەسەر ئەوەی کە ڕوبەڕوی تەواوی ئەو ستەمانە بێتەوە کە پەیماننامەی ڤێرسای بەسەر ئەڵمانیادا سەپاندبوی و کاربکات لەسەر سڕینەوەی تەواوی دەرەنجامەکانی ئەو پەیماننامە شومە.. کۆنگرەی میونخ بەسەرکەوتویی ئەنجامدرا و جیهان لە دوا ساتدا توانی خۆی لابدات لەشەڕ، تشمبرلینیش گەڕایەوە بۆ ئینگلتەرا تا مزگێنی ئاشتی بدات بە وڵاتەکەی..

دوای ئەوەی کە سوخۆرە جیهانیەکان پلانەکانیان سەری نەگرت بەهۆی هەڵوێستی تشمبرلین و زانیان کە ناتوانن شەڕ هەڵبگیرسێنن تەنها بە ناچار کردن و لابردنی نەبێت، بۆیان دەرکەوت کە هێدی هێدی ئەم کەسە دەبێتە نەیاریان، هەر بۆیە فەرمانیان دا بە دەزگا و ڕێکخراوەکانیان تا شەڕ لە دژی تشامبرلین هەڵبگیرسێنن، چەکی یەکەمیان لەو شەڕەدا بریتی بو لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەکردن کە خۆیان زاڵ بون بەسەری دا.. ئەم دەزگایانە پێکەوە دەستیان کرد بە هێرش کردنە سەر تشامبرلین و تۆمەتباریان کرد بە پیلان گێڕان و گوێگرتن لە هیتلەر و بگەرە پێشیان وت کە مەیلی بەلای فاشیزم دا هەیە، دەزگاکانیان لە ئەوروپا ئەو تۆمەتانەیان دوبارە کردەوە تا وای لێهات کە لکا بە کەسایەتیەکەیەوە.. تا ئێستەش زۆرینەی سەرچاوە جیهانیەکان و کتێبەکانی مێژو کەلە بارەی ڕێککەوتنەکانی میونیخەوە لێکۆڵینەوەی کردەوە ئەڵێت کە ئەوە شکست بوە بۆ ئاشتی و ئەوروپا و تشمبرلین ئەگەرچی ئەو ڕێککەوتن نامەیە تارمایی شەڕی دورخستەوە و ئاشتی جیهانی پاراست...

ڕامزی و ئەدمیراڵ دومفیل هەولیان دەدا کە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر بدۆزنەوە تا بتوانن بیخەنە پێش چاوی سەرۆك وەزیران تا بەشێوەیەکی یەکلا کەرەوە بیهێننە سەر ئەو بڕوایەی کە چ مەترسییەك ڕوبەڕوی دەبێتەوە.. دواجار بەخت یاوەری بو بەهاتنی کەسێك بە ناوی "تایلەر کانت" ئەو ئەفسەرە ئەمەریکییەی کە بەرپرسی وەرگرتن و ناردنی بروسکە بو بە شێوەی هێما وشیفرە لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە لەندەن، ئەڵبەتە بەهاوکاری کەسێك کەناوی خاتو "ئانا ولکوف"، ئەم دوکەسە بە پێی پۆستەکەیان دەیانتوانی دەسیان بگات بەو دۆکیۆمێنتە نهێنیانەی کە دەهاتە ناو باڵوێزخانەی ئەمەریکاوە و دواجار لەو زانیارییانە ئەوە تێگەیشتن کە جەنگ نزیکە بە بێ ئەوەی کەسانی دیکە بەو ڕاستیە بزانن و بە بێ ئەوەش هیچ کام لە گەلەکان بەرژەوەندییان هەبێت لە شەڕێکی لەو چەشنەدا، ئەو کاتەش کە زانیان لایەنی سودمەند تەنها کۆمەڵەی جولەکە خاوەن سەرمایە جیهانیەکانن، ویژدانیان جوڵا و بیریان لەوە کردەوە کە هەولێکی شێلگیرانە بدەن بۆ ڕێگرتن لەو شەڕە. زانیارییە سەرەکیەکانیان لەو بروسکانەوە وەرگرت کەلە نێوان تشێرشل و سەرۆکی ئەمەریکی ڕۆزفێلت ئاڵوگۆڕی پێ ئەکرا، ئەو بروسکانە پەردەی لەسەر ئامانجی ئەو کەسانە لادا کە بە شێوەیەکی نهێنی دەسەڵاتیان بەدەستە و ڕێنمایی دەدەن بە تشێرشل و ڕۆزفێلت.. تایلەر ئەیزانی کە ڕامزی و ئەدمیراڵ دۆمفیل نوێنەری ئەو دەستە بژێرەن لە کەسایەتیە ئینگلیزەکان کە کاردەکەن لەسەر دژایەتی کردنی سەرانی جولەکە و دورخستنەوەی جیهان لە شەڕ.. بەم شێوەیە دواجار تایلەر چو بۆ بینینی ڕامزی و ئەوەی خستە ڕو کە بچێت بۆلای تا دۆکیومێنتە سەرەکیەکانی بۆ بهێنێت تا بیبینێت لە ماڵەکەی کە دەکەوتە گۆڕەپانی گلۆستو لە لەندەن ژمارە ٤٧، ڕامزی وێنەیەکی ئەو دۆکیومێنتانەی دەست کەوت و خستیە بەردەست تشامبرلین و ئەویش بۆی دەرکەوت کە جیهان بەرەو چ چارەنوسێك دەڕوات.. بەڵام لە ئەڵمانیا ململانێی شاراوە لە نێوان هیتلەر و نازییە توند ڕەوەکاندا بو کە نوێنەری چینی ئەرستۆکراتی سەربازی جێرمانی بون، ئەگەرچی هیتلەر بە شێوەیەکی تەواوەتی لە ساڵی ١٩٣٦ ەوە گونجاو بو لەگەڵ

ئەو چینە، هیتلەر لەو باوەڕدا بو کە دەتوانێت بگاتە ڕێککەوتن لەگەڵ بەریتانیا و ڕۆژئاوا و ئامانجەکانی دیاری بکات لە ڕێگەی هێنانەدی داواکارییەکانی ئەڵمانیا بە تایبەت نەهێشتنی تەواوەتی کاریگەرییەکانی پەیماننامەی ڤێرسای، بەڵان نازییە توندڕەوەکان بڕیاریان دابو کە هاوڕێیەتی هیتلەر بکەن تا کۆتایی و دواتر دەست بەرداری بن یاخود ناچاری بکەن تا بەردەوام بێت لەسەر هێنانەدی ئامانجەکانیان کە بریتی بو لە زاڵ کردنی نەژادی ئەڵمانیا بەسەر جیهان لە ڕێگەی هێزەوە، هیتلەر لە لایەکی دیکەوە لە دوای کۆبونەوەی لەگەڵ تشیمبرلین هاتبوە سەر ئەو باوەڕەی کە سەرۆك وەزیرانی ئینگلیز هاتبوە سەر ئەو باوەڕەی کە درك بە مەترسی جولەکەی جیهانی بکات و دڵسۆزی ئەوە بو کە گوێ لە خواستی سوخۆرە جیهانیەکان نەگرێت، هەر بۆیە ئەمە پاڵی بە هیتلەرەوە ئەنا تا خۆی لابدات لە بەرکەوتن لەگەڵ ئینگلتەرا. هەر بۆیە بۆچەند مانگێك بێدەنگی و گوێ پێ نەدانی یاداشتەکەی کرد لە لایەن پۆڵۆنیاوە، هەروەها بێ دەنگی کرد لەو سوکایەتیانەی کە ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوا دەیکرد بە خۆی و بە ئەڵمانیا، ئەو ڕۆژنامانەی کە جولەکەکان زاڵبون بەسەریدا.. ئەڵبەتە تەنها لەوەدا سەرکەوتوبو کە ساتی یەکلا کەرەوە دوابخات. لەبەر ئەوەی نیگەرانی تا دەهات زیادتر دەبو و شاڵاوی پڕوپاگەندە لە ئەوروپا و گوشاری نازییە توند ڕەوەکان تا دەهات زیادتر دەبو لەسەری بە شێوەیەك کە ئیدی بەریەك کەوتن ببوە کارێك کە نەدەکرا خۆی لێ لابدات. دواجار لە یەکی ئەیلولی ١٩٣٩ جەنگی جیهانی دووەم هەڵگیرسا کاتێك کە سوپای ئەڵمانیا چوە ناو پۆڵۆنیاوە و داگیر کرد.

هیتلەر لەو کەسانە نەبو کە بە ئاسانی لە بۆچونی خۆی پاشگەز بێتەوە. ئەگەرچی کە جەنگی لە دژی بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی ڕاگەیاند دوای ئەوەی کە ئیدی هیچ ڕێگەیەکی دیکە نەما. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی بەوەهەبو کە باشترین ڕێگە چارە ئەوەیە کە لە گەڵ بەریتانیا ڕێك بکەوێت و بە یەك لێدان کۆتایی بهێنێت بە سوخۆرە جیهانیەکان. ئەڵبەتە سوخۆرە جیهانیەکان ئەوەیان ئەزانی کە گەمە بە چارەنوسی خۆیانەوە ئەکەن بە درێژایی مێژوی

پیلانگێڕی خۆیان، وەئەگەر هیتلەر بیتوانیایە خۆی لەشەڕ لابدات، دواجار هەر لەناوی ئەبردن. ئەو نازیانەش کە خۆیان هێزیان پێ بەخشی تەنها لەبەر ئامانجێك بو کە ئەویش هەڵگیرساندنی جەنگێکی سەرتاپاگیر بو کە ئەڵمانیا تیایدا ببێتە یەکێك لە سەربازگەکانی. لەو سەروبەندەدا تشمبرلین هەروەك ڕێکرێك وابو بۆیان تەنانەت دوای هەڵگیرساندنی جەنگیش.. لەبەر ئەوەی تشمبرلین ئاواتە خوازی ئەوەبو کە دەرفەتێك بۆ ئاشتی بێتە پێشەوە تا ئەویش قبوڵی بکات.

سوپاکانی ئەڵمانیا وەك گەردەلول هەڵیانکرد و پۆڵۆنیایان داگیر کرد، دواتر فەرەنسا و ئەڵمانیای ڕۆژئاواشیان داگیر کرد، یەکەی تانکەکانی ئەڵمانیا کە بە بانزەر ناوبانگیان دەرکردبو دەیانتوانی کە ڕوبەڕوی سوپای بەریتانی ببنەوە و شکستی بدەن بەڵام هیتلەر لە ٢٢ ئایاری ١٩٤٠ فەرمانی وەستانی دا.. دەقی ئەو بروسکەیەی کە جەنەڕاڵ "ڤۆن کلایست" فەرماندەی تانکەکان بەدەستی گەیشت بەم شێوەیەی لای خوارەوە بو:

"ئەبێت تەواوی یەکەی تانکەکان هەر ئێستا بوەستن لە مەودایەکی مام ناوەندا لە شاری دنکرك... تەنها ڕێگە ئەدرێت بە جوڵەی بەرگریکارانە و نواڕین بۆ کۆکردنەوەی زانیاری".

جەنەڕاڵ ڤۆن کلایست هیچی نەمابو کە تێك بچێت کاتێك کە فەرمانی پێکرا ڕابوەستێت لەبەر ئەوەی هێزەکانی ئەیتوانی بە تەواوەتی سوپای ئینگلیز تێك بشکێنێت. زۆری نەخایاند کە بروسکەیەکی سەیرتری بەدەستگەیشت کە فەرمانی پێ ئەکات پاشەکشێ بکات بۆ پشت هێڵەکانی شەڕ کردن کە دەکەوێتە نزیك ناوەندی شارەوە دوای ئەوەی کە تانکە ئەڵمانیەکان بەر لە سێ ڕۆژ ئەو شوێنەی تێ پەڕاندبو..

کاپتن لیدڵ هارت کە یەکێك بو لە ئەفسەرەکانی جەنەڕاڵ ڤۆن کلایست لە کتێبەکەی کە دواتر نوسی لە ژێر ناوی "لایەکی دیکەی گردەکە" باس لەوە ئەکات کەلە چاوپێکەوتنی هیتلەر لەگەڵ مارڵ ڤۆن ڕۆتشید دا ڕویدا کە فەرماندەی باڵای هێزەکانی ئەڵمانیا بو لەگەڵ جەنەڕاڵ ڤۆن کلایست هات تا

ناڕەزایەتی دەر ببڕن بەرامبەر بەو فەرمانە سەیرانە: ئەو دو فەرماندە سەربازییە سەریان سوڕما کاتێك کە هیتلەر پێی ڕاگەیاندن کە بە تایبەت ئەو فەرمانانەی دەرکردوە تا ڕێگە بە سوپای بەریتانیا بدات پاشەکشێ بکات و بتوانێت هێز و ناوبانگەکەی بپارێزێت.. لەبەر ئەوەی باوەڕی بە مانەوەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی هەیە و ئومێدی وایە لەو ڕێگەیەوە بتوانێت بکاتە ڕێك کەوتنێکی ئاشتی لەگەڵ لەندەن تا دەستبەجێ کۆتایی بەجەنگ بهێنێت لەسەر بنەمای دانانی ئینگلتەرا بە دەستکەوتەکانی ئەڵمانیا.

لێرەدا ئەبێت ئەوە بهێنینەوە یاد کە هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا لە ماوەی چەند مانگی سەرەتای شەڕدا بۆردومانی بەریتانیایان نەدەکرد. گەر بە شێوەیەکی وورد تر بڵێین دەڵێین لەکاتی بونی تشامبرلین لە دەسەلاتدا، بەریتانیاش بۆردومانی خاکی ئەڵمانیای نەدەکرد وەك جێبەجێکردنێك بۆ ئەوەی تشامبرلین ڕای گەیاند لە ٢ ئەیلولی ١٩٣٩ واتە ئەو ڕۆژەی کە جەنگ ڕاگەیەنرا و تیایدا وتی کە فەرمان ئەکات بە هێزەکانی تا جگە لە ئامانجی سەربازی، لە هیچ ئامانجێکی دیکە نەدەن.. واتە لە هاولاتی سیڤیل نەدرێت و شارەکان بەئاسایش بمێنێتەوە.

شەڕ بۆ ماوەیەك بەردەوام بو دوای پاشەکشێی ئینگلیزەکان لە دنکرك بە شێوەیەکی نیمچە ئاشتیانە، ئەڵمانەکان پەلاماری ئینگلیزەکان نادەن و ئینگلیزەکانیش بە شێوەیەکی سنوردار چالاکی ئەنجام دەدەن.. تەنانەت ئەو کاتە ناوی ئەو شەڕە نرا شەڕێکی هیچ و پوچ، ئەمەش ئەو شەڕە نەبو کە نازییە توند ڕەوەکان لە ئەڵمانیا و سوخۆرەکان لە بەریتانیا دەیان ویست، هەر بۆیە هەڵمەتی پڕوپاگەندە کردن لە دژی تشامبرلین لە ئینگلتەرا دەستی پێکرد و هاوکات هەڵمەتی گوشاز دەستی پێکرد تا هاوشێوە لۆرد ئاسکویت دەستی لە کارکێشایەوە و کەسێك جێگەی گرتەوە کە هەمان سیمای ئەو کەسەی هەبو کە لە ساڵی ١٩١٦ جێگەی ئاسکویتی گرتەوە، ئەو کەسەش کە جێگەی تشامبرلینی گرتەوە کەسێك بو بە ناوی ونستۆن تشێرشل. ئەو ڕۆژەش کە چوە دەسەلات لە ١١ مارسی ١٩٤٠ فەرمانی دەرکرد بۆ فڕۆکە بەریتانیەکان تا

هێرش بکەنە سەر شارە ئەڵمانیەکان بۆ یەکەمین جار و بەوەش دەرگا کرایەوە بە ڕوی هێرش کردنە سەر هاوڵاتی سیڤیل لە ناو شارەکاندا. ئەمەش تەواوی ئەو شتە بو کە نازییە توند ڕەوەکان ئەیانویست، ئەوانەی کە خۆشحاڵبون بە توند بونەوەی جەنگ و پێیان وابو کە ئەوە دەرفەتێکی گونجاوە بۆ داگیرکردنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەیەك کاتدا بە تایبەت کاتێك کە سەر سام بون بەو سەرکەوتنانەی کە سوپای ئەڵمانیا بەدەستی هێنا لە ساڵی یەکەمی جەنگدا هەر بۆیە لە ساڵی ١٩٤١ کۆبونەوەیەکی گشتی سەرکردایەتیان ئەنجامدا و تیایدا بڕیاریان دا کە سود وەربگرن لە سیاسەتی مەیل داری هیتلەر بە لای ئینگلتەرا تا ڕێڕەوی جەنگ بگۆڕن ئەویش لە ڕێگەی ناردنی نوێنەرێکی تایبەتی خۆیان بۆ بەریتانیا تا حکومەتی بەریتانیا ڕازی بکات بەوەی کە لەگەڵ ئەڵمانیا بەشەڕ نەیەت و بێ لایەن بێت تا ڕێگە بە سوپای ئەڵمانیا بدات یەکێتی سۆڤێت داگیر بکات و کۆتایی بە کۆمۆنیزم بهێنێت.

بۆ ئەو کارە کەسایەتییەکی دیاریان هەڵبژارد کە ئەویش ڕۆدۆڵف هس بو کە بەدەستە ڕاستی هیتلەریش دادەنرا تا ببێتە نێردەیان بۆ لای ئینگلیزەکان..

جیهان ئەو کاتە سەری سوڕما کاتێك کە بیستی هس هەڵهاتوە و پەنای بۆ ئینگلتەرا بردووە، هیتلەریش یەکێك بەو لەو کەسانەی کە سەریان سوڕما لەبەر ئەوەی نەیدەزانی کە بۆچی یاریدەدەرەکەی هەڵهاتوە، هس لەگەڵ تشێرشل بە ئامادە بونی لۆرد هامیلتۆن کۆبوەوە و بۆچونی سەرکردەکانی ئەرستۆکاتیەتی سەربازی ئەڵمانیای ڕونکردەوە کە کورت دەبێتەوە لە پێك هات لەسەر ئاگربەست لە نێوان هەردولا و بەڵێنی ئەوان بۆ دەستبەجێ خستنی هیتلەر و کۆکردنەوەی توانایان بۆ یەکێتی سۆڤێت، ئەڵبەتە کە تشێرشل ئەو پێشنیارەی ڕەت کردەوە.

هەر ئەو کاتە سەرکردە نازییە توند ڕەوەکان ڕویان لەهیتلەر کرد و بۆچونی خۆیان ڕا گەیاند و بە هیتلەریان وت کە پێویستە پەلاماری یەکێتی سۆڤێت بدات تا پشتی پارێزراو بێت کاتێك کە دەست دەکات بە چالاکییە سەربازییە دور مەوداکانی، هیتلەر ڕێگەیەکی دیکەی نەدۆزییەوە جگە لە ڕەزامەند بون بە

بۆچونەکەیان، هەر بۆیە لە ٢٢ حوزەیرانی ١٩٤١ سوپاکانی ئەڵمانیا چونە ناو سنوری یەکێتی سۆڤێتەوە.

بە ڕاگەیاندنی شەڕ لە لایەن ڕۆزفێڵتەوە لە دژی ئەڵمانیا، جەنگەکە بوە جیهانی و تشێرشل بو بە پیاوی یەکەمی ئەو هاوپەیمانێتییەی کەلە دژی ئەڵمانیا ڕاگەیەنرا و بو بە پیاوی بە هێزی بەریتانیا، یەکەم کار کە کردی بریتی بو لەدەستگیر کردنی تەواوی نەیارە سیاسیەکانی و بۆ ماوەیەکی دیاری نەکراو خستنیە زیندانەوە کە هەندێکیان تا کۆتایی جەنگی خایاند ئەویش بە پێچەوانەی ئەوەی کە بەریتانیا زانیویەتی لە بارەی مێژەوەکەی خۆیەوە، هەر یەك لە ئەدمیراڵ دومفیل و بەڕێز ڕامزی و هاوسەرەکانیان و ژمارەیەك لە هاوڕێکانیان دەستگیرکران سەرباری سەدان هاوڵاتی دیکە، هۆی بێدەنگی گەلی بەریتانیاش دەرهەق بەم دەستگیرکردنانە دەگەڕایەوە بۆ ئەو هەڵمەتی پرۆپاگەندەیەی کە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی سەر بە سوخۆرەکان دورستیان کرد لەمەڕ ئەوەی کە تابورێکی پێنجەمی هیتلەری گەورە لەناو بەریتانیادا هەیە و داواکرا کە دەستگیر بکرێن.

لێکۆڵینەوەکانی دەزگای هەواڵگری بەریتانیا و هێزی دادوەری لە بەریتانیا ئەو بوختانانەی بەدرۆ خستەوە و لەسەر دەستگیرکراوەکان هیچ بەڵگەیەك بەدەست نەهات کە هاوکاری ئەڵمانیایان کردبێت. سوخۆرەکان ویستیان کە هەمان تۆمەت بۆ خاتو نیکولسون دروست بکەن کە هاوسەری ئەمیراڵ نیکولسون بو، کە یەکێك بو لە گەورە ئەفسەرە دەریاییەکان، بەڵام دادگا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر ئەویش بەدەست نەکەوت و بە بێ تاوان لە قەڵەمی دا. بەڵام حکومەتی تشێرشل دەستگیری کرد بە بێ بونی هیچ تۆمەتێك وەك تۆڵە کردنەوەیەك بەرامبەر بەو داواکارییانەی کەهەیبو دژ بە بەرپاکردنی جەنگ، بەر لەوەی کە جەنگ هەڵبگیرسێت.

تەواوی فەرمانەکانی دەستگیر کردن و تەواوی ئەو کارانەش کە نەدەهاتەوە لەگەڵ دەستور و ئینگلتەرا بەناوی "هێربێرت مۆریسۆن"ەوە دەردەکرا کە وەزیری ناوخۆ بو لە حکومەتەکەی تشێرشل، مۆریسۆن لە ساڵی ١٩٥٤

جارێکی دیکە دەرکەوتەوە لە کەنەدا کاتێك پێشەنگی هەڵمەتێکی دەکرد بۆ کۆکردنەوەی هاوکاری دارایی بۆ زایۆنیزم.. بەم شێوەیە پەیوەندییەکە ڕون و دیارە لە نێوان حکومەتەکەی تشێرشل و سەرانی جولەکەی جیهانی. زیندانیش نەیتوانی فەرماندەیەکی وەك ئەدمیراڵ دومفیل بێ دەنگ بکات، هەر ئەوەندەی کەلە زیندان ئازاد کرا، کتێبە بە ناو بانگەکەی "لە ئەدمیراڵێکی دەریاوانی تازەکارەوە" بڵاو کردەوە و تیایدا نهێنی ڕوداوەکانی دەرخست و ئەو لایەنانەشی خستە ڕو کە هۆکار بون بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم و لەوەش گەلی ئینگلیزی ئاگادار کردەوە و دواتریش جەنەڕاڵ ڕامزی هەستا بە چاپکردنی کتێبێك بە ناو نیشانی "جنگێکی بێ ناونیشان"، ئەم دوکتێبە سەرباری نەمانی لە کتێبخانەکاندا توانی نهێنیەکانی پیلانگێڕان ئاشکرا بکات بۆ ڕای ئینگلیز و ئەوروپا. سەرۆك وەزیرانی پێشو بە ئازارەوە کۆچی دوایی کرد دوای ئەوەی کە بینی وڵاتەکەی بەرەو هەڵدێر ئەبرێت تەنها لە پێناو بەرژەوەندی کۆمەڵێك سوخۆری جولەکە، تا ڕۆژی مردنیشی ناوی زڕێنرا لەلایەن ئەو کەسانەوە، تەنانەت ئێستا لە کتیبەکانی مێژودا ئەو ناوزڕاندنە بەدواوەیەتی وەك کەسێکی ترساو لە هیتلەر باسکراوە لە کاتێك دا کە ونستون تشێرشل ڕو لە هەرکوێیەك بکات هەڵئەنرێت و لێوان لێوە لە سەروەری.. من لێرەدا نەمەوێت ئەم بەشە کۆتایی بهێنم بە باسکردن لە دو ڕاستی سادە و لەهەمان کاتدا قووڵ، پێشکەشی ئەکەم بە سێر ونستون تشێرشل و ئەوانەی کە بوغرا ئەبن بە سەرکەوتنێکی کاتی لە ڕۆژئاوا:

ڕاستی یەکەم ئەوەیە کە مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ خۆیدا هیچ جۆرە پیاهەڵدان و ڕێزلێنان و زێڕ و زیوێك بەرێتە گۆڕەوە.

ڕاستی دووەم ئەوەیە کە گۆڕ کۆتایی نییە بەڵکو ئەو ڕێگەیەیە کە دەرباز بون لێی نییە، لە دوای گۆڕیش هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ خۆلادان لە سزا، هەر بۆیە سوخۆرە جیهانییەکان هیچ دەرفەتێکی دەرباز بونیان نیە.

## بەشی دوانزەهەم

# جیهانی ئێستامان

شوێن پێی پیلانگێڕی جیهانیمان هەڵگرت بە درێژایی چەند سەدەیەك تا ئەو کاتەی کە گەیشتینە کۆتایی ڕێگەکە لە جەنگی جیهانی دووەمدا، ئەو جەنگەی کە بەڵاکانی تەواوی نەتەوەکانی گرتەوە بە شێوەیەك کە پێشتر نەبو، لە هەموشوێنێك وێرانی و بەدەیان ملیۆن قوربانی و ملیۆنەها هەتیو و بێلانە و بریندارو پەك کەوتوی بەجێهێشت...

تەواوی ئەو تاوانانە ئەنجامدرا لە پێناو هێنانە دی خەونی کۆمەڵێك شێتی خۆپەرست، ئەو کۆمەڵەیەی کە چەندین سەدەیە داهێنەرانە خراپە بەڕێوە ئەبەن و ناسەقامگیری مادی و ڕۆحی و بەدڕەوشتی بڵاو ئەکەنەوە نەوە لە دای نەوە.. ئەم جەنگە ئەبوایە ببێتە وانەیەك بۆ مرۆڤایەتی تا بە شێوەیەك ئاڕاستەی بکات کە ئیدی بتوانێت خۆی بپارێزێت لە کارەساتێکی دیکە و بگەڕێت بە شوێن هۆکاری قەیران و نائارامیەکان تا چارەسەری بکات بە پێی بنەماکانی دادپەروەری و لۆژیك و ڕاستی، ئەو بنەمایانەی کە تەواوی ئاینە ئاسمانیەکان و یاساکان بانگەشەی بۆ ئەکەن و ڕێگەیان بۆ دیاری کردوە و هێزە چاکەکارەکان ئەوپەڕی هەوڵ ئەدەن کە داکۆکیان لێ بکەن و بیچەسپێنن لەناو مێشکی کەسەکاندا.

بەڵام جیهان جارێکی دیکە دەستی کردوە بە ڕێکردن لەسەر ڕێگە کۆنەکە و ڕوداوەکان وەك کۆن دوبارە بونەوە هەروەك ئەوەی کە جیهان هیچ لە ڕوداوەکانی پێشوەوە فێر نەبوبێت و بە بەردەوامی خۆی دوبارە بکاتەوە. ڕەنگە پێویست بێت کە کەمێك لەسەر ئەم وشانەی دوای بوەستین: هیچ شتێك لە ژێر خۆردا نویٚ نییە... ئەمڕۆکە چەند لە دوێنێ ئەچێت.. یاخود مێژو خۆی دوبارە ئەکاتەوە... هەر وەك ئەوەی کە گەلەکان بە شێوەیەکی ئاناگایانە درکیان بە تێکەڵ بونی ئەو ڕوداوانە کردبێت کە لەسەردەمەکانی پێشوتردا ڕویان داوە، ئەمەش شتێکی سروشتییە لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە ڕوداوەکان بە ڕێوە ئەبەن لە پشت پەردەوە هەر ئەو کەسانەن کە هیچ نەگۆڕاون و پلانەکانیشیان تا ئەمڕۆکە جێبەجێ ئەکرێت.. ئەم کتێبەش شتێك نیە جگەلە هۆشدارێك بۆ ئەو کەسە بێ ئاگایانەی کە لە ئەمەریکا و ڕۆژئاوا ئەژین، هۆشدارییەکە لەسەر ئەو مەترسییەی کە ڕوبەڕویان ئەبێتەوە و لەناویان ئەبات ئەگەر بەر لە کاتی خۆی نەکەونە خۆیان.. ئەو مەترسییەی کە لە ڕێکخراوی زایۆنیزم و هێزە شاراوەکاندا دا خۆی دەبینێتەوە، ئەو هێزەی کە باڵادەستە بەسەریدا و لە بەرژەوەندی ئەو کاردەکات[١٠]...

ئەمڕۆکە کەس ناتوانێت بزانێت کە جیهانی ئێمە بەرەو کوێوە ئەچێت جگە لە ڕێگەی هەڵهێنجانی ئەوەوە نەبێت کە بە شێوەیەکی گشتی بەراوردی ئێستا بکات بە ڕابوردو لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی ئێستا ئەیزانین لەسەر پلانەکانی هێزە شاراوەکان.. ئەڵبەتە ڕاستییەك هەیە هەموان ئەیزانن: نەخشە کێشان بۆ ژیانی ئەمڕۆمان لە کۆنگرەکانی تاران و یاڵتا و ئەمستردام کێشرا (١٩٤٣-١٩٤٦) لە نێوان سێ سەرکرە "تشێرشل و ڕۆزفێڵت و ستالین" هەروەها هیچ کەسیش ناتوانێت پەی بەو نەخشانە بەرێت کەلەو کۆبونەوانەدا کێشراون تەنها ئەو

---

([١٠]) نوسەر لەم کتێبە و چەند بڵاوکراوەی تر کە کۆمەڵەیەك لە ئەمەریکیە بە ئاگاکان دەری دەکەن بانگەوازێکی دیکە ڕادەگەیەنێت داوا لە دەنگدەرە ئەمەریکیەکان دەکات و دەڵێت پێویستە شیکاری مەیل و بیرکردنەوەی هەر کەسێك بکەین کە هەڵی دەبژێرین بۆ پۆستێکی گشتی تا ئەگەر هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان دۆزیەوە لە نێوان ئەو کەسە و جولانەوەی جولەکەی جیهانی و زایۆنیزم دەنگی پێ نەدەن..

کەسانە نەبێت کە لە پۆستی باڵادا بون، ناوەڕۆکی ئەو کۆبونەوانە تا ئێستا شاراوەیە و کەس لە بارەیەوە هیچ نازانێت.. ڕەنگەی گۆڕانکاری نویێ ڕۆژێك لەداهاتودا ئاشکرای بکات. کەس ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە ئەوە ئەوانە بون ئەم جیهانەیان دروست کرد و ڕێنمایی ئەو سێ گەورە سەرکردەیەیان ئەکرد، ئەمەش ڕوداو گەلێکمان بۆ ڕون ئەکاتەوە کە جێگەی سەر سوڕمانە وەك دانپیادانانی ئەمەریکا وستالین بە دەوڵەتی زایۆنیزم هەر لەسەرەتای ڕاگەیاندنیەوە.. ئەڵبەتە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو سێ گەورە سەرکردەیە یەك دڵ بوبێتن و لەیەك بەرەدا بو بێتن بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە لەبەر ئەوەی کە ستالین لە پێش جەنگ لە سوخۆرە جیهانیەکان هەڵگەڕایەوە و توانی لە ڕێگەی پاکتاوکردنەکانەوە ڕزگاری بێت لە سەرجەم سەرکردە جولەکە کۆمۆنیزمەکان، دروست کردنی هاوپەیمانێتیش لەگەڵ ڕۆژئاوا و دواجار لەگەڵ سوخۆرە جیهانیەکان تەنها دەرەنجامێك بو بۆ ڕوبەڕوبونەوەی دوژمنێکی هاوبەش کە نازیزم بو: بە مانایەکی دیکە ئەرستۆکراتیەتی سەربازی نەژاد پەرستی جێرمانی.

بۆمبی ئەتۆمی: هێرۆشیما و ناکازاکی

لەگەڵ نزیك بونەوەی کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم، سوخۆرە جیهانیەکان درکیان بەوە کرد کە ستالین ئامادەیە ئەوروپا داگیر بکات و پەلاماری ئەمەریکا بدات تا بەیەکجاری لەناوی بەرێت و دەسەڵاتی کۆمۆنیزم بڵاوە بکاتەوە لە بەسەر سەرتاسەری جیهاندا.. سەرکردە سەربازی و سیڤیل و نیشتیمانیەکانیش درکیان بە مەترسیەکە کردبو، بەڵام ئەوان پێیان وابو کە تەنها ڕێگە چارە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەو حاڵەتە کۆتایی هێنانە بە جەنگ لەگەڵ یابان و ئاشکرا کردنی ئەو پرسە لەگەڵ گەلەکانی خۆیان و لەهەمان کاتا ئەنجامدانی دانوستانی ئاشکرا لەگەڵ ستالین.. ئەڵبتە ئەم ڕێگە چارەیە بە مانای ئاشکرا بونی سوخۆرە جیهانیەکانیش دێت بۆیە هیچ دودڵ نەمان لە

هەڵبژاردنی بژاردەیەکی دیکە کەلە بیرکردنەوەیانەوە نزیك بو ئەویش بریتی بو لە نیشان دانی هێزێکی یەکلاکەرەوە بۆ ستالین و نمایشی ئەوەی کە وەڵامیان چۆن ئەبێت ئەگەر پەلاماری ڕۆژئاوا بدات... یابانیش بۆ ئەوە هەڵبژێردرا تا ببێتە قوربانی، یاخود کێڵگەی تاقیکردنەوە، ئەڵبەتە بیریان لەوە نەکردبۆوە کە ئەو تاقیکردنەوەیە بە سەدان هەزار کەس لەناو ئەبات لە بروسکەیەکی ترسناکدا لەبەر ئەوەی ئەو هێزە یەکلاکەرەوەیە شاراوە بو لەناو ئەو چەکە ترسناکەی کە ئەو کات بەچەکی ئەتۆمی ناسرابو.

ناڕەزایەتی هەندێك لە گەورە ئەفسەرانی ئەمەریکی کارساز نەبو ئەوانەی کە بێزار بون لە بەکارهێنانی ئەو ڕێگە وەحشیگەرییە لەبەر ئەوەی برنارد باروخ و سوخۆرە جیهانیەکانی دیکە توانیبویان سەرۆك ڕۆزفێلت بهێننە سەر ئەو بڕوا دڵڕندانەیەی کە پێویستە ئەو چەکە بەکار بهێنن و بەو شێوەیەش یەکەمین بۆمبی ئەتۆمی کەوتە سەر هێرۆشیما و ئەوەندەی نەخایاند کە بۆمبی دوەمیش درا بەسەر ناکازاکی دا.

دوای تێپەڕ بونی چەند ڕۆژێکی کەم لە بەکارهێنانی ئەو دو بۆمبە ئەتۆمییە یابان خۆی دا بەدەستەوە، لە بەرامبەردا هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەی گەورە دەست پێکرا و تەواوی دەزگاکانی ڕاگەیاندن خرایە کار تا پاساو بهێنێتەوە بۆ ئەو کارە دزێوە بەو بیانوەی کە بەهۆی ئەوەوە بو کە یابان خێرا خۆی دا بەدەستەوە و دواجار هەر بەو هۆیەوەبو کە جەنگ زو کۆتایی پێهێنرا.. بەڵام لە ڕاستیدا یابان بەر لە بەکار هێنانی ئەو دو بۆمبە هیچی نەمابو کەخۆی بدات بەدەستەوە، ئەم زانیارییەش خودی مارك ئارسەر ڕایگەیاند کە فەرماندەی هێزەکانی ئەمەریکا بو لە ڕۆژهەڵاتی دور لەگەڵ چەند فەرماندەیەکی دیکەی هێزەکانی ئەمەریکادا.. بگرە دواتر پەردە لادرا لەسەر ئەوەی کە یابان چەند جارێك هەوڵی داوە داوای خۆ بەدەستەوەدان بکات و بچێتە دانوستانی ئاشتیەوە، بەڵام هەولەکانی ڕەت کراوەتەوە و ئەمەش ئاماژەیەك بە ئاڕاستەکردنی کەسانێك بو کە خۆیان ئامادە کردبو بۆ هەڵدانی بۆمبە ئەتۆمیەکان.

## جیهانی ئەمڕۆمان

دەرەنجامی شەڕ بەم جۆرە و هەڵدانی دو بۆمبی ئەتۆمی هۆکار بو بۆئەوەی کە ڕێك کەوتننامەکانی تاران و یالتا و بۆتسدام چەق ببەستێت، ئەو ڕێك کەوتننامەیەی کە سەرلەنوێ جیهانی دابەشکردەوە بۆ ناوچەی جێ هەژمون، بەمەش ئاواتی گەلانی بچوکی بردە ژێر گڵەوە، ئەم ڕێککەوتننامەیە لەناوەڕۆکدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبو لەگەڵ پەیماننامەی ڤێرسای.. بەم شێوەیە گەلان لە جەنگی جیهانی دووەم هاتنە دەرەوە تا دوبارە خۆیان بێ توانا ببینێتەوە لەوەی کەبتوانن چارەنوسی خۆیان دیاری بکەن و بۆیان دەربکەوێت کە ئەو هێزە شاراوانەی کە یاری بە چارەنوسیان ئەکات هیچ قورساییەك دانانێت بۆ بەها ڕۆحی بنەماکانی ڕەوایەتی و دادپەرەری.. بەڵام ئەم جارە کارەکە جیاوازە لەچاو پێشتر، ئەم جارە مرۆڤایەتی بەئاگا بۆتەوە و ئیدی ناکرێت شتێکی هاوشێوەی پەیماننامەی ڤێرسای بەزۆر بسەپێت بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی بەرگری توند نەکرێت.. شاندی وڵاتە یەکگرتوەکان هەوڵێکی دا تا لە ڕێگەی ئاشتیەوە چارەسەری کێشەکان بکات بەڵام هێزە شاراوکان هەروەك هەمیشە چوە ناو ئەو شاندەوە و زاڵ بو بەسەری دا، لە هەندێك لە بڕیارەکانیشدا بە ڕونی کاریگەری ئەو هێزانە هەست پێ ئەکەین بەتایبەت کاتێك دەستەوەستان ئەبێت لەبەرامبەر وەڵامدانەوەی هەندێك لەو ستەمە ئاشکرایانەی کە دەکرێت و چەندین گەلی پێ دوچار ئەبێت، یاخود دەستوەستان ئەبێت کە هەندێك لە بڕیارە دادپەروەرانەکانی جێبەجێ بکات، هەر بۆیە پێویستە لەسەر جیهان کە ئاگاداری ئەوەبێت کە ڕو ئەدات لە نەتەوەیەکگرتوەکان و هێندەش بە ئاگابێت کە بتوانێت ڕێگری بکات لەوەی کە هێزەکانی خراپە کاری تێ بکات.

ئەڵبەتە نەتەوە یکگرتوەکان تەنها هەمو شتێك نییە لەبەر ئەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی دور و ئەفەریکا و ئەمەریکای باشور و تەنانەت

وڵاتەکانی هەردو سەربازگەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دوچار بە کێشەگەلێکی هەمەچەشن ئەبنەوە کە ڕێگە چارەیەکیان بۆ ئەدۆزیوەتەوە.. پڕوپاگەندە چەواشەکارییەکانیش بە شێوەیەکی ئەهریمەنانە دادەڕێژرێن تا بیری گەلان ژەهراوی بکەن و مێشکی پڕ بکەن لە زانیاری چەواشەکارییانە بە ئامانجی دابەشکردنی هێزەکەی و لابردنی لە سەر ڕێگەی ڕاست. ئێستاکە جیهانی ئێمە و بۆیەکەمین جار لە مێژودا گۆڕانکاری قوڵ بە خۆوە ئەبینێت کە تەواوی لایەنەکانی ئەگرێتەوە، شەپۆلی ڕزگاری خوازی گەلانی بچوکی گرتۆتەوە، ئێستا یاری کردن بە چارەنوسی گەلان ئاسانتر بوە لە چاو پێشوتردا. ئەڵبەتە ئەمە ڕێگری ئەکردووە لە هێزەکانی خراپە تا سود لە سادەیی ئەو گەلانە وەربگرێت تا لە ڕوی مادی و بیر و ئابورییەوە گەمارۆیان بدات و بەهاگەلە ڕۆحی و ئاکارییەکانی تێك بشکێنێت و بەرتیل و گەندەڵی و کینە بڵاو بکاتەوە تا بتوانێت هەژمونی خۆی ڕابکرێت بەسەریدا.. لەدوای مردنی ستالینەوە گۆڕانکاری ڕیشەیی هاتە ئاراوە لە یەکێتی سۆڤێت. بەرپرسە نوێکان ئەو دێوەزمەیەیان لادا کەلەسەر سینەی گەلی یەکێتی سۆڤێت بو و بەبێ ترس پەردەیان لادا لەسەر لایەنە شاراوەکانی سیاسەتی ستالین و ڕەوش و ڕێگەکانیان ئاشکرا کرد و وڵاتەکەیان دەرکرد لەو گۆشەگیرییە ئاسنینەی کە تیایدا دەژیان.. گۆڕانکارییەکی گەورەش لە ئەمەریکا ڕویدا بەتایبەت لە کاتی سەرۆکی کوچ کردو کەنەدی کە چەند هەوڵێکی دڵسۆزانەی دا تا لەپرسی گەلان و تارمایی شەڕ و گەلی ئەمەریکی تێبگات.. تا ئێستاکەش گۆڕانکارییەکان بەردەوامن لە ژیانی ئەمەریکادا.

گومانی تێدا نییە کە جیهان ئەپرسێت ئەبێت قۆناغی داهاتو چی لە هەگبەی خۆیدا هەڵگرتبێت؟ بەڵام ئەڵبتە داهاتو موڵکی کەس نییە و تەنها شتێك کە ئەتوانین بیکەین ئەوەیە کە ڕابوردو بە داهاتو بەراورد بکەین و بیرۆکەیەکی گشتی هەڵهێنجین لە لێکۆڵینەوەی مێژو.. ڕەنگە بتوانین بە پشت بەستن بەو وەدەرەنجامە بڵێین کە ساڵانی داهاتو ڕوداو گەلێکمان بۆ ئاشکرا ئەکات کە جیاواز لە هەر جۆرە پێش بینی کردنێك و پلان دانانێك و ڕەنگە درێژ مەوداش بێت بە شێوەیەك کە بتوانێت سیمای جیهانی ئێستا بگۆڕێت.. هێزە

پیلانگێڕە جیهانیەکانیش نامۆ نابن لەم حاڵەتە بەڵکو ئەو پەڕی هەوڵی خۆیان ئەدەن کە ڕۆڵی شاراوەی خۆیان بگێڕن: لەناوبردنی ئازادی و پارچە پارچە کردنی گەلان چ لەسەر ئاستی ناوخۆ و چ لەسەر ئاستی دەرەکی و هێدی هێدی زاڵ بون بەسەریدا هەم لە ڕوی مادی و هەم لە ڕوی بیر و ئابورییەوە جا ئیتر بە هەر ڕەوش و لە ژێر هەر دەمامکێك دا بێت تا وای لێدێت تەواوی جیهان لەبەرژەوەندی ئەو کار دەکات..

پێمان وایە ئەمەی لەم کتێبەدا باسی لێوە کرا بەسە تا "هۆشداریمان پێ بدات لەسەر ئەو پیلانگێڕییە بەردەوامە جیهانیەی تا پەردە لەسەریان هەڵبماڵرێت و ڕاستەیەکانیان ئاشکرا بکرێت".. پێویستە جیهان ئێستا بە ئاگابێت لەوەی کە هێزە شاراوەکان کارئەکەن لەسەر ئەوەی کە جەنگی جیهانی سێهەم هەڵبگیرسێنن کە ئەگەر ڕو بدات لێدانێکی یەکلا کەرەوە ئەبێت بۆ مرۆڤایەتی و ئیدی ئەو کاتە کەس ناتوانێت لەبەرامبەریدا بوەستێت.. بۆیە پێویستە لەسەر گەلان ئەوە لەبەرچاو بگرن کە دەبێت ئاگایانە ڕوبەڕوی هەر لایەنێك ببێتەوە کە جیهان بەرەو جەنگی جیهانی سێهەم ڕابکێشێت، ئەوەندە بەسە کە باس لەوە بکەین کە وێرانییەکی سەرتاسەری دەرەنجامی ئەو شەڕە ئەبێت و تیایدا براوە و دۆڕاو و بینەر وەك یەك ئەبن.. تەنها براوە بازرگانانی شەڕ ئەبن یاخود بە مانایەکی دیکە سەرانی جولەکەی جیهانی.

شەڕی مرۆڤایەتی تاقەت پڕوکێن ئەبێت لەگەڵ دوژمنەکانی لەبەر ئەوەی زیرەك و خاوەن ئەزمونن و دەستیان گرتوە بەسەر وزەیەکی مادی و بیری مەزن دا.. ئەوان ئەتوانن هەر دەمامکێك بکەن و بچنە ناو دڵی هەر گەلێکەوە لە ژێر سیمای جیاوازدا، بەڵام تۆ هەمیشە دەیاندۆزیتەوە لەپاش گەندەڵی و لەشفرۆشی و کینە و ئەو قەیرانە کۆمەڵایەتی و ئابوریانەی کە ژیانی گەلان تێك ئەدات.. ڕێگە ڕزگاربونیش بریتیە لە ڕێگەی پاراستنی بەها گەلە فیکری و ڕۆحیەکان.. ئەو باها گەلەی کە ئەوە لە دوای ئەوە مرۆڤایەتی دروستی کردووە بە درێژایی مێژوی خۆی و یاسا ئاسمانی مرۆییەکانیش پاڵپشتی ئەو بەهاگەلەن.

"من باخی بونی ئێوە و دڵە ڕەقەکەتان ئەناسم، ئێوە لە دوای مردنی من لەو ڕێگەیە لادەدەن کە من بۆم دیاری کردون و دواجار توشی خراپە دەبن"

"موسا د.خ"

هەندێك لە هێلكارییەكانی جولەكە و پەیبیان بە هەندێك لە تاوانەكانیان بردووەو دواتر دوچاری ترسی "ڕێكخراوی جیهانی" بون وایان لێ هاتوە كە هەر شتێك بگێڕنەوە بۆ ئەو هێزە شاراوانە. هیچ گومانی تێدانیە كە جولەكە جۆرێكی دیكەن لە مرۆڤ. خاوەن خەسڵەتی دیاری كراو و تاوانی تایبەتن. لە تەواوی ڕوداوە مێژووییەكاندا خاوەن ڕۆڵێكی ناشرین بون، هەر ئەوانن كە هۆكاری ئازار وماڵوێرانیەكانی مرۆڤایەتین. بەڵام دەرەنجامی كارەكانیان زیادتر لە هەر كەسێكی دیكە ئەگەڕێتەوە بۆ خۆیان. هەمیشەش سەركەوتن هاوپەیمانیان نەبوە لە قۆناغەكانی ژیانیاندا سەرباری ئەوەی كە هەندێك جار سەركەوتنی كاتیان بەدەست هێناوە، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەوان جۆرێكی دیكەن لە مرۆڤ.

موسا ئایینی جولەكەی هێنا بۆ گەلێكی دیاری كراو لە دۆخێكی دیاری كراودا، لەناو ئەو ئاینەدا كۆمەڵێك بیرو بۆچون هەیە كە گەورەترین كاریگەری هەبوە لەسەر جولەكە بە درێژایی مێژو. گەلەكەی موسا لە میسر ئامۆ بون، فیرعەون ئەیچەوساندنەوە، لە لایەن میسرییەكانەوە دورخراوە بون و بەسوك سەیر ئەكران، جولەكەكان ڕاهاتبون بە چەوساندنەوە و زەلیلی، هەر بۆیە پێویست بو كە هەست بە خۆیان بكەن و بگەڕێنرێنەوە بۆ ئاستی مرۆڤایەتی، هەر بۆیە پێغەمبەرەكەیان پێی وتن كە ئەوان هەڵبژێردراون تا ئەو ئەمانە هەڵگرن كە پێیان سپێردراوە، تا متمانەیان بگەڕێتەوە بۆ خۆیان و هەستیان بەرز بێتەوە بۆ ئاستی هەستی مرۆڤایەتی، ئەوان بۆ ئەو ئەركە هەڵبژێردران بەڵام بۆ ئەو كارە نەشیاوبون هەربۆیە لە لایەن خوا و مرۆڤەوە كەوتنە بەر ستەم. ئەمەش لە ناخیاندا كینەیەكی قوڵی چاند كە ئەوە لە وای ئەوە بۆیان مایەوە و وایكرد كە ئەستەم بێت دەركردنی ئەو هەستە لە دڵیان و گێڕانەوەیان بۆ ناو مرۆڤایەتی. پیاوە ئاینەیكانیان ئەم هەلەیان قواستەوە و ئەمەش پێگەیەی تایبەتی پێ بەخشین هەر بۆیە هەستان بە شێواندنی ئایین ئەوەش كە هاوكاری كردن ئەوە بو كە ئاینی جولەكە كۆنترین ئاینی ئاسمانییە، ئەو كۆنییە هاوكاری كردن تا گۆڕانی زۆر لەو ئاینەدا بكەن و لە ڕێی لابدەن و لە

هەمان کاتدا هەستی خۆ بە گەورە زانی و دەسەلات و کینە و حەزی تۆڵە سەندنەوە تیایاندا گەشەی کرد.

بەم شێوەیە مێژویان ئاوێتەی پلاندانانی تاوان کارانە و نهێنی تەواوەتی بو. ڕێگەیان بە خۆیان ئەدا ڕێگە گەلێك بگرنە بەر کە بەدەر بێت لە سەروشتی مرۆڤایەتی بە پاڵپشتی فەتوای حاخامەکانیان و هەمیشەش دەرەنجامەکانیان شکست و سەر شۆڕی بو. هەمیشە دوای شکست وێرانی و ئاوارەبون و دواتر پلان و کار و دوبارە شکست و سەر شۆڕی و... هەر هەوڵێکیش کە بیدەن بۆ دەس گرتن بەسەر قودس، بەدوایدا لێدانێکی قورس و ئاوارەبونێکی نوێ دێت. ڕەنگە هەر ئەم تێبینیە بێت کە وای لە دیگۆل کرد پێشبینی ئەوە بکات و بڵێت کە دوبارە لە جیهاندا دابەش دەبنەوە.

موسا لە ساڵی ١٤٥١ پێش زایین کۆچی دوایی کرد و نەچوە ناو ئۆرشەلیمەوە، شائۆل و داود کە لە ساڵی ٩٥٠ پ ز کۆچی دواییان کرد سەرۆکایەتیان ئەکردن، لەو کاتەدا دابەش و دژ بە یەك بون، سەرباری ئەوەی کە چونە ناو ئۆرشەلیمەوە بەلام وڵاتێکی سەربەخۆیان نەبو لە فەلەستین.

لە ساڵی ٧٢٢ پ ز سەرجوقی گریکی دەستی گرت بەسەر سامەڕا کە پایتەختی یەکێك لە شانشینەکان بو لەو کاتەدا.

لە ساڵی ٥٨٦ پ ز بەختنسر دەستی گرت بەسەر شانشینی یەهەزا و دەستی گرت بە سەر پایتەختەکەی کە قودس بو و پەیکەری سلێمانی تێکدا و خەڵکەکەی بە دیل گرت و بردنی بۆ بابل و حەفتا هەزاری لێ کوشتن. لە ساڵی ١٦٠ پ ز کەوتنە ژێر دەسەلاتی ڕۆمانەکان.

لە ساڵی ٧٠ ز تیتسی ڕۆمانی شۆڕشێکی لەناو برد کە ئەوان پێی هەڵسابون و قودس لەو سەرو بەندەدا وێران کرا و پێش بینییەکەی مەسیح هاتە دی.

لە ساڵی ١٣٥ ز هەوڵیان دا دەوڵەتێك دروست بکەن و بۆ ئەو کارە هەستان بە کوشتاری مەسیحیەکان لە قودس، لە وەلامدا ڕۆمانەکان تێکیان شکاندن و

نزیك به ملیۆنیكیان لیّ لەناو بردنن و ئەوەش كە لێیان مایەوە بەناو وڵاتدا بڵاو بونەوە.

لە سەدەی چوارەم هەوڵیان دا پەیكەرەكە دروست بكەن بەڵام بە زەمین لەرزەیەك بەسەر دروست كەرەكانی دا ڕوخا.

لە سەدەی شەشەم كۆبونەوە و كە سێكیان لە سامرییەكان كرده شای خۆیان و دوبارە هەستان بە كوشتنی مەسیحەكان، بەڵام ئەم جارە جوستنیانوس تێكی شكاندن.

لە سەرەتاكانی سەدەی حەوتەم هەوڵیان دا پشتیوانی لەفارسەكان بكەن لە كوشتاری مەسیحیەكان لە فەڵەستین لە ڕێگەی دروست كردنی حكومەتێك بۆیان لەویّ بەڵام شكستیان هێنا و پەرش و بڵاویان بەردەوام بو لە تەواوی جیهاندا.

ئەو وڵاتانەش كە تیایدا پەرش و بڵاو ببونەوە حاڵیان لەو حاڵەی كە لە فەڵەستین هەیان بو باشتر نەبو، خراپەیان هەبو بۆ تەواوی ئەو گەلانەی كە لەگەڵیاندا ژیاون. هەر ئەوەندەی كە هەستیان بە بەهێزی خۆیان كردووە هەوڵیان داوە ئەو دەستە ببڕن كە چاكەی لەگەڵ كردوون، بۆیە هەر تەریك و دورخراوە بون و بەسوك سەیریان كراوە و كار گەیشتۆتە ئەوەی كە دەركراون و لەناو براون.

بە درێژایی مێژویان تەنها توانیویانە هەندێك لە سەركردەكان بخەڵەتێنن، ڕەنگە بۆ ماوەیەك توانیبێتیان ئەو كارە بكەن بەڵام زۆر بەردەوام نەبون. بانگەشەشیان بۆ ئاشتی نەیتوانیوە كەس بخەڵەتێنێت.

مەسیح د خ پێیان ئەڵێت:

"ئەی نەوەی مارەكان، چۆن ئەتوانن باس لە ئاشتی بكەن لە كاتێكدا نێوە خۆتان خراپن؟".

جۆرج واشنتۆن سەرۆكی وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمەریكا پێیان ئەڵێت:

"جێگەی داخە کە دەوڵەتێك نەیتوانیوە خاکەکەی خۆی لەو مێش و مەگەزە پاك بکاتەوە سەرباری ئەوەی کە زانیوەتی کە چین. جولەکەکان دوژمنی خۆشبەختی ئەمەریکا و تێکدەرەی ئەو خۆشگوزەرانیەن کە هەیەتی".

کێش ئەزانێت؟ ڕەنگە ئەگەر کەنەدیش لەسەر دەسەڵات بەردەوام بوایە هەمان قسەی بکردایە بگرە ڕەنگە جولەکەش بەوەیان زانیبایە بۆیە هەستان بە کوشتنی بەر لەوەی کە بێتە قسە. بەڵام ئایا ئەیبەخشرانن لە لایەن گەلی ئەمەریکاوە؟

بەڵام ماسۆنیەت کە زایۆنیم پێی وایە کە دەستی گرتوە بەسەریدا، ئایا ڕاستە کە ئەندامەکانیان داردەستن بەدەست جولەکەوە؟ ئێمە پێمان وانیە، بۆنمونە لە وڵاتی ئێمەدا ماسۆنی زۆرە بەڵام تەنها ناوەکەیان بیستوە. بازرگان هەن کەتەنها لەپێناو پارە پەیوەست بون و کەسانی گێلیش هەن تەنها لە پێناو ئاشتیدا پەیوەست بون، هەمو ئەوانەش کاتێك کە ڕاستی ئەزانن ئەبنە دوژمنی سەرسەختی زایۆنیزم لەبەر ئەوەی زیاد لە هەر کەسێکی دیکە هەڵخەڵەتاون.

کۆمۆنیزمیش لە سەردەمی خرۆشۆفەوە هەوڵ ئەدات کە خۆی ڕزگار بکات لە دەسەڵاتی جولەکە. ئەو کێشانەش کەلەم دواییانەدا دروست بون لە دژی یەکێتی سۆڤێت لە وڵاتەکانی ئەورروپای ڕۆژهەلات سەرجەمان دروست کراوی جولەکەن. لەوڵاتانی ئێمە کۆمۆنیست گەلێکی زۆر هەن کە داد پەروەرییە گەر پێمان وابیت پەیوەندییان بە دەرەوە نییە، زۆریش لەو کەسانە لە کۆمۆنیزم هیچ تێ ناگەن تەنها ئەوە نەبێت کە ئەیان خاتە ژیانێکی بەهەشت ئاساوە.

ئێمە کاتێك کە ئەم کتێبە بڵاو ئەکەینەوە تەنها لە پێناو ڕۆشنبیرکردنی خوێنەری عەرەبە، ئەمانەوێت لەوە تێ بگات کە جولەکە گەلێکی پیلانگێڕن، لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانیان ناشرینترین ڕێگە بەکار ئەهێنن.. بەڵام ئێمە ئەمانەوێت ئەوەش بزانێت کە زایۆنیزم شتێك نیە کە نەتوانین خۆمان ڕزگار بکەین لە دەستیان، وەك خۆیان ئەڵێن "گەلی هەڵبژاردەی خوا"، بەڵام ڕێکخستن بێ سەرەوبەردیی قبوڵ ناکات، زانستیش گێلی قبوڵ ناکات، ئیمانیش لەگەڵ

بیٚ ئیمانی نایەتەوە، کاریش بەرامبەر نییە تەنها بە نییەت هیٚنان، هاوکارییش بەرامبەر نییە بە دوبەرەکی.

داگیر کردنی قودس لە لایەن جولەکەوە ئاماژەیە بۆ ویٚرانکارییەکی نویٚ و کۆتایی هیٚنانی یەکجارەکی بە گاڵتەجاڕی "گەلی هەڵ بژاردە خوا"، ئەمەش ئەبیٚت پاڵنەریٚکی بەهیٚز بیٚت بۆ کاری شیٚلگیرانە بۆ ڕیٚکخستنەوە و گیٚڕانەوەی کارە نادروستەکان لەقەڵەستین بۆسەر ڕیٚڕەوی سروشتی خۆیان لەبەر ئەوەی ئیٚستاش سەرکەوتن لە ئاسمانەوە دانابەزیٚت و لە ناخی زەویشەوە هەڵناقوڵیٚت، بەڵکو لە لایەن دەستانی کەسانی دڵسۆزەوە دروست ئەکریٚت، ئەمەش سونەتی خوایە بۆ بەندەکانی و هیچ جیٚگرەوەیەکیش نیە بۆ ئەو سونەتە.



## ولیام گای کار

له ١٨٩٥/٦/٢له بەریتانیا له دایک بوە. نوسەر، لێکۆڵەر، مامۆستای زانکۆ و شارەزا له تەورات و شوێنەوارە کۆنەکان. خوێندنی له ئوسکوتلەندا تەواو کردووە. ماوەیەک له فەڵەستین ژیاوە و وانەی له زانکۆی عبری وتۆتەوە له قودس. سەردانی ناوچە جیاوازەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستی کردووە. ئەفسەر له هێزی دەریایی بەریتانیا. له وەزارەتی راگەیاندن و هەواڵگری دا کاری کردووە. هەردو زمانی عەرەبی و عبری زانیوە. له ساڵی ١٩٥٢کتێبی دزینی نەتەوەیەک بلاو ئەکاتەوە. گرنگ ترین لێکۆڵینەوەی لەسەر هەڵگیرساندنی سێ جەنگی جیهانی بوە و (WW3)له کتێبەکەی بەرد گەلیکی سەر تەختەی شەترەنج بە تێروتەسەلی باسی لێوە کردووە. ١٩٥٩/١٠/٢له ئۆنتاریۆ کۆچی دوایی کردووە.

تەنها له ساڵی ١٩٥٠دا توانیم پەی بەو نهێنیە بەرم کاتێک کە زانیم ئەو شەڕ و شۆڕانەی ژیانمان ژێروژور ئەکات و ئەو بێسەرەوبەرەییەش کە بە بێ هۆ زاڵە بەسەر ژیانماندا هیچ نیە جگە له پلانێکی ئەهریمەنانەی بەردەوام، ڕەنگە ئەو پیلانە لەو بەشەی گەردون دەستی پێکردبێت کاتێک کە ئەهریمەن ڕەتی کردەوە کە وشەی خوا لەسەرو هەمو شتێکەوە بێت. له بەهەشتەوە بۆ سەرزەوی. ئەو ڕاستی و بەڵگە حاشا هەڵنەگرە پەرتەوازانەی کە بەددستم هێنان له سەرتاسەری جیهاندا پچڕ پچڕن بون و ڕێک نەدەخران ئەمەش بەردەوام بو تا گەیشتمە ئەو ڕاستیە و تێگەیشتم کە زانیاریمان لەسەر بونەوەرێک نیە کە له گۆشت و خوێن دروست کرابێت، بەڵکو لەگەڵ هێزی ڕۆحی و ئەو بیرانەدایە کە له تاریکیدا کار ئەکات و زاڵە بەسەر زۆرینەی ئەو کەسانەی کە پۆستی گرنگیان بەدەستەوەیە له جیهاندا. هیچ هەست بەشەرم ناکەم کاتێک کەدان بەوەدا دەنێم کە ئەوە کتێبە پیرۆزەکان بو کە ڕێگەیان پیشان دام تا بگەمە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوم.

نرخ ( ٧٠٠٠) دینار